پێشکەشە بە

هەموو گەنجانی وڵاتەکەم بە گشتی و قوتابیانی ئامادەیی و زانکۆ بە تایبەتی

# پێشەكی

الحمد لله وكفى والصلاة والسلام على نبيه المصطفى ومن اهتدى بهداه.

بەلای هەموو مسوڵمانێكەوە شتێكی ڕوون و ئاشكرایە كە شەریعەتی ئیسلام هاتووە بۆ بەختەوەری مرۆڤایەتی لە دوور و نزیك لە دونیا و دوارۆژ لەسەر ئاستی تاك و كۆمەڵ.

دەتوانین بە دەستەواژەیەكی تر بڵێین دین هاتووە بۆ:

دابینكردن و پاراستنی بەرژەوەندییەكانی مرۆڤایەتی، وە هاتووە بۆئەوەی هەرچی زیان و زەرەرە لێیان دورخاتەوە، وە دەتوانین بڵێین: هاتووە بۆ دابینكردنی هەموو بەرژەوەندییەكان، چونكە بەرژەوەندییەكان بە ئەرێنی و نەرێنی (إیجابی وسلبی) هەردووكی دەگرێتەوە مادام شەریعەت ئەوە بێت دەبێ بە وردەكاری باسی لە گرفتەكانی مرۆڤایەتی كردبێت و چارەسەری بۆ دانابێت. بەتایبەت كۆمەڵێك گرفت و تاوان هەن هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەكەن، وە یەكێك لە تاوانە هەرە ترسناك و بێزراوەكان بریتییە لە زینا، كە ساڵانە ئەم تاوانە سەدان هەزار قوربانی دەخاتەوە، بەڵام مرۆڤایەتی گوێی خۆی لێ ئاخنیوە، لەبەرئەوەی دەیان ئامانجی دوور و نزیكی ناحەزانمان دەپێكێ لە شەڕی بایۆلۆجی و لەكار خستنی توانای گەنجان و ساغكردنەوەی ماددە هۆشبەرەكان و خواردنەوە زیانبەخشەكان، كە ئەم مادده هۆشبەر و سڕكەرانە بەزۆری ئەم پێڕە ساغی دەكاتەوە، لەولاشەوە بەكرێگیراوەكان و دوژمن و شەڕواڵپیسەكان بازاڕی خۆیان لەوەدا دەبیننەوە،

بۆیە هەوڵ بۆ هیچ چارەسەرێكی جددی نادرێت، بەڵكو بازاڕی بۆ خۆشدەكرێ بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ.

لەگەڵ ئەوەشدا من كەمترین نوسین و لێكۆڵینەوەم بینی لەم بوارەدا، بەڵێ هەندێك شت نوسراوە لە ناو كتێبەكان یان هەندێك وەرگێڕان هەیە، بەڵام ئەوە بەس نییە بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشەیە، بەتایبەت گەنج شتێكی ڕوون و خاڵبەندكراوی لا نییە كە تۆزێك بەوردی باس لە هۆكار و شوێنەوار و چارەسەری زینا بكات، زیاتر مەبەستم كتێبخانەی كوردییە بە ناوی زینا یەك سەرچاوەشم بە كوردی دەستنەكەوت، بەڵكو بەناوی ترەوە هەبوو یان لەناو كتێبەكاندا باسكراوە یان ئەگەر وەرگێڕانێك هەبێت، بۆیە بیرم لەوە كردەوە كە دەبێت كتێبێك هەبێت كە بە ڕوونی ناونیشانەكەی باسكردن بێت لە تاوانی زینا و شوێنەوار و چارەسەر.

هەرچەندە من نوسینم بەكوردی نەكردووە، بەڵام با ئەوە دەستپێك بێت و یەكەم نوسین بێت كە بەكوردی دەینوسم بەڵكو قەڵەمبەدەستانی گەلەكەم لە داخی ئەم نوسینە شتی زۆر جوان و نایاب پێشكەش بكەن، وە كە سانی زۆر ئازیز داوایان كرد و هانیان دام منیش لەڕێز و خۆشەویستی ئەوان دەستم پێكرد قسەی ئەوانم پێنەشكا.

پلانی نوسینەكەشم بەو شێوەیەی خوارەوەیە:

١. سەرەتا باسكردنی تاوانی زینا.

٢. پاشان باسكردنی تاوانی زینا لە ئایینە ئاسمانییەكان بەتایبەت یەهودییەت و مەسیحییەت و ئیسلام.

٣. باسی هۆکارەکانی زینا.

٤. باسی شوێنەواری زینا.

٥. باسی چارەسەری تاوانی زینا لەگەڵ کۆتایی و ناوی سەرچاوەکان.

داواکارم لە پەروەردگار ئەو کارەم بۆ ئاسان بکات و لێمانی وەربگرێ.

## زینا چ دەگەیەنێ و بە چی دەگوترێت زینا ؟

زینا لە زمانی عەرەبیدا بە چەند واتایەك هاتووە:

- بەواتای چونە لای ئافرەت بەبێ مارەکردن یان خاوەنداریەتی[١].
- بەواتای خراپەکاری (فجور) هاتووە[٢].
- بە مانای تەنگەبەری و بەرزی پەنابردن هاتووە[٣].
- بە مانای نزیکبوونە و میزگیرانیش هاتووە[٤].

کەواتە زینا بەم واتایانە بەکارهاتووە:

- نزیکبوونەوە
- بەرزبوونەوە
- خراپەکردن
- وەتەنگ هاتن
- میزگیران
- پەناگرتن

---

١- المعجم الوسيط لنخبة من العلماء.

٢- القاموس المحيط فيروز آبادي.

٣- تهذيب اللغة.

٤- تهذيب اللغة.

## زینا بەپێی زاراوەی شەرعی

زانایان پێناسەی جۆرا و جۆریان بۆ زینا کردووە، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە بریتییە لەوەی پیاوێك و ئافرەتێك خێزانداربن یان نا جوتبوون لەگەڵ یەکدا بکەن بۆ هەردووکیان لە دامێنەوە[1].

- ✓ بەڵام ئەگەر لە دواوە بوو پێی دەگوترێت: زینا ؟
- ✓ ئایا ئەگەر لە ناو وڵاتی مسوڵمانان نەبوو هەمان حوکمی هەیە ؟
- ✓ ئایا کە نەزانێ حەرامە یان نا هەمان حوکمی هەیە ؟
- ✓ ئایا زیندوو بێت یان مردوو بێت ؟

لەسەر هەموو ئەمانە ڕاجیایی هەیە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە زینایە و تاوانە، بەڵام لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا سزای زینای لەسەر جێبەجێ دەکرێ یان نا وەك گوتمان ڕاجیایی لەسەرە و ئەو بابەتانە بە درێژی لە کتێبە فیقهیەکاندا باسکراون.

---

١- تحفة الفقهاء: ٣ / ١٣٨. الذخيرة: ١٢ / ٤٧. المهذب في الفقه الشافعي: ٣ / ٣٣٤. الهدايه على مذهب أبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني: ١ / ٥٣٠.

## زینا لە هەرسێ شەریعەتە ئاسمانییەکە حەڕامکراوە

زینا لە کتێبی پیرۆز (مقدس)دا:

١. حوکمی ئەو کەسەی زینا دەکات دەکوژرێت. بە پێی سفری لاوین، ٢٠/ ١٠.

٢. سزای زیناکار بەرد بارانکردن و بەشمشێر پارچەپارچە کردن و ماڵ سوتاندن و جێبەجێ کردنی سزاکە بە بەرچاوی ئافرەتانی زۆرەوە - حزقیال ١٦ – ٣٠ – ٤١.

٣. لە سفری أیوب – ٢٤ – ١٥ – ٢٥ دا هاتووە کە زۆر بەخراپی وێنای کەسی زیناکار دەکات کە لە شەواندا دەردەکەون و ڕۆژانە خۆیان دەشارنەوە و چاویان بە ڕوناکی هەڵنایە بەرەبەیان لای ئەوان سێبەری مردنە هەتا کۆتایی.

٤. لە أمثالی (٣٠) دا هاتووە ئایەتی ١٨ – ٢٠ کە پیاوێك لەگەڵ کچێك زینا دەکات وەك ئەو شتە سەیرانە وایە:

- ڕێگای سیسرکە کەچەڵ لە ئاسمان.
- ڕێگاي مار لەسەر بەرد.
- ڕێگای کەشتی لە قوڵایی دەریا.

واتا: ئەوانە چەند نامۆ و سەیرن زینا کردنی پیاوێك لەگەڵ کچێك ئاوا نامۆ و سەیرە و بزردەبێ و دواتر حاشا و نکۆڵی لێدەکرێ.

٥. لە لاوینی (١٨) دا هاتووە ئایەتی ٢٠ – ٢٩ کە تێیدا باس لەوە کراوە نابێت ئافرەت لە کاتی پیسیدا جوتبوونی لەگەڵدا بکرێت، نزیك خێزانی هاوڕێکەت مەکەوە زینای لەگەڵ بکەی چونکە پیس دەبی پێی. لەگەڵ نێردا فاحیشە مەکە وەك لەگەڵ مێدا دەیکەی چونکە پیسە. فاحیشە لەگەڵ ئاژەڵدا مەکە پیس دەبیت، با ئافرەتێك لە بەرامبەر ئاژەڵێکی نێردا ڕانەوەستێ بۆ ئەوەی بیخاتە سەر خۆی چونکە فاحیشەیە.

دەبینین چۆن نەهی کراوە لەو ڕابواردنانە.

- لە ئینجیلی مەتای (٥) دا هاتووە ئایەتی ٢٩ ئەگەر چاوی ڕاستت تەڵەی بۆنایەوە دەریبێنە و فڕێی بدە باشترە...
- لە ئینجیلی لۆقای (١٨) دا هاتووە ١٨ – ٢٠ پیاوێك پرسیار لە عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەکات چی بکات بۆ ئەوەی ژیانی هەتا هەتایی دەست بکەوێ، یەکەم ئامۆژگاری پێی دەڵێ: زینا مەکە.
- لە سفری تەکوینی (٣٩) دا هاتووە لە ئایەتی ٧ تا ١٨ هەمووی باسی یوسف دەکات کە ئامادە نەبووە لەگەڵ خێزانی هوذا، واتا: عەزیزی میصر زینا بکات.
- لە پەیامی عیبرانیەکاندا بە ژمارە ١ ئایەتی ٤ کە فەرمان دەکات پارێزگاری لە ڕێزی هاوسەری بگیرێ لە جێگای خەوتنتان دوور بخەنەوە، خوای گەورە لەمەودوا سزای ئەوانە دەدات کە ڕۆدەچن لە خراپەکاری و زینا.

- وە دەیان دەقی تر هەیە کە باس لە تاوانی زینا دەکات بە چەندین شێوە، لە یەك شوێنیش بە چاکە باس نەکراوە.

## تاوانی زینا لە ئیسلامدا

بێگومان هیچ شەریعەتێك و دینێك ئەوەندەی ئیسلام گرینگی بە ژیانی مرۆڤایەتی نەداوە و گرفتەکانی بۆ چارەسەر نەکردووە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە گشتی و تاوانی زیناش بەتایبەتی، بۆیە تاوانی زینا لە ئیسلامدا بە چەندین شێوە باسکراوە کەمێك ئاماژەی پێدەدەین.

**أ-** پەروەردگار لە چەندین دەقدا بە شێوەیەکی گشتی (فاحشە)ی قەدەغە کردووە کە زینا و تاوانە گەورەکان دەگرێتەوە، بۆ نمونە:

❖ ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٢٨ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩﴾ [الأعراف: ٢٨-٢٩].

❖ ﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣﴾ [الأعراف: ٣٣].

❖ ﴿۞قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ

ﭐلنَّفْسَ ﭐلَّتِي حَرَّمَ ﭐللَّهُ إِلَّا بِﭐلْحَقِّۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴿١٥١﴾ [الأنعام: ١٥١].

❖ ﴿إِنَّ ﭐللَّهَ يَأْمُرُ بِﭐلْعَدْلِ وَﭐلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ﭐلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ﭐلْفَحْشَآءِ وَﭐلْمُنكَرِ وَﭐلْبَغْيِۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴿٩٠﴾ [النحل: ٩٠].

ئەمە ئەوە دەگەنێت کە پەروەردگار زۆر بە توندی فاحشەی قەدەغە کردووە و بە تاوان ناساندویەتی و بە کردەوەی خراپەکارانی داناوە.

**ب-** لە فەرمودەدا هەڕەشەی توند لە زیناکار کراوە بۆ نمونە:

١. (لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن). کەواتە پێچەوانەی ئیمانی تەواوە.

٢. پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی مانگیراندا فەرمووی: (يا أمة محمد ما من أحد أغير من الله من أن يزنى عبده أو أن تزنى أمته). وە لە فەرمودەیەکدا بە درێژی باس لەوە کراوە کە پێغەمبەر ﷺ زیناکارەکانی لە خەودا بینیون کە لەناو تەندوری ئاگردا بوون[١]. زانایان دەفەرموون ئەوە حاڵی بەرزەخی زیناکارانە کە تا قیامەت لەو ئازارەدا دەمێننەوە.

٣. پەروەردگار هەڕەشەی گەورە دەکات لەو کەسانەی کە حەزیان لێیە فاحشە و زینا و خراپەکاری بڵاو بێتەوە، وەك لە سوڕەتی(النور – ١٩) دا هاتووە.

٤. ئەوەی ئەو تاوانە دەڕازێنێتەوە شەیتانە (البقرة- ٢٦٨).

---

١- بخاري: ٧٠٤٧.

٥. ئەهلی شەهەوات و ئارەزووبازەكان ویست و كاریان ئەوەیە كە خەڵك بەلای ویست و ئارەزووبازیدا ڕابكێشن و لە خراپەدا بەكاریان بهێنن.

٦. پەروەردگار زینا بە فاحشە و خراپترین ڕێگا ناودەبات، وە ڕێگری كردووە لە نزیك بوونەوە لێی(الإسراء – ٣٢).

٧. زیناكار مەحروم و بێبەش دەبێت لە هاوسەری كردن لەگەڵ ئینسانی مسوڵمانی پاك (النور – ٣).

٨. ئەو كەسانەی میراتگری بەهەشتی فیردەوسن ئەو كەسانەن كە داوێنی خۆیان دەپارێزن و سنورەكانی خوا ناشكێنن، بەتایبەت دەربارەی ڕابواردن مەگەر لەگەڵ هاوسەرەكانیان و كەنیزەكەكانیان (المؤمنون – ٥-٧).

٩. پەروەردگار تاوانی زینای لەگەڵ هاوبەش پەیداكردن و كوشتندا باسكردووە، وە لەنێوان ئەو سیفەتانەدا كە دەبنە هۆی ئەوەی بەندە پێی بگوترێت (عباد الرحمن) ئەوەیە كە دووربێت لە زینا (الفرقان – ٦٨-٧٠).

١٠. لە فەرموودەدا هاتووە كە ئاگری دۆزەخ بە شەهەوات و ئارەزووەكان دەورەدراوە، واتا: بەهێزترین تەڵە كە شەیتان دەینێتەوە بۆ خستنە ئاگرەوە ئارەزووەكانن وە زینا لەسەروی هەموویانەوە: (حفت النار بالشهوات)[١].

---

١- بخاري: ٦٤٨٧، أبو داود: ٤٧٤٤، الترمذي: ٢٥٦٠، النسائي: ٣٧٦٣.

**١١.** بە هەمان شێوە لە فەرموودەدا هاتووە هەر گەلێك توشی زینا بێت توشی دەرد و نەخۆشی وا دەبن كە لە ئوممەتەكانی پێشودا نەبووە: (ولم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون و الأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا)[١]. كەواتە زینا سەرچاوەی برسیەتی و وەبا و دەرد و نەخۆشییە بەتایبەت ئەو دەرد و نەخۆشییانە كە پێشتر نەبوون.

**١٢.** لە فەرموودەیەكدا زینا لەگەل تاوانی هاوبەشدانان و كوشتنی منداڵی خۆت باسكراوە، بەتایبەت زینا لەگەڵ جیران، ابن مسعود دەفەرموێ: پرسیارم لە پێغەمبەر كرد ﷺ چ تاوانێك لەلای خوای گەورە لە هەموو تاوانێك گەورەترە فەرمووی: (أن تجعل لله نداً وهو خلقك. قلت: إن ذلك لعظيم، قلت: ثم أي؟ قال: و أن تقتل ولدك تخاف أن يطعم معك. قلت: ثمّ أي؟ قال: أن تزاني حليلة جارك)[٢].

**١٣.** لەبەر گەورەیی تاوانەكە گەورەترین سزای بۆ دانراوە لە دارلێدان و ڕەجمكردن بەپێی ڕای زۆربەی زانایان: (خذوا عني خذوا عني البكر بالبكر)[٣].

---

١- سنن ابن ماجة: ٤١٠٦، المستدرك: ٨٦٧٠.

٢- صحيح البخاري: ٤٧٦١ – ٦٠٠١، مسلم: ٨٦.

٣- مسلم: ٤٣٦٨.

١٤. ئەگەر ئەو کەسەی زینا دەکات بەساڵاچوو بێت تاوانەکەی گەورەترە: (ثلاث لایكلمهم الله یوم القیامة و لایزكیهم و لهم عذاب ألیم: شیخ زان و ملك كذاب و عالم مستكبر)[١].

١٥. پێغەمبەر ﷺ کە بەیعەتی لە ئافرەتان و پیاوان وەرگرتووە یەکێك لە بەندەکانی ئەوە بووە کە زینا نەکەن (الممتحنة – ١٢).

١٦. خوای گەورە کەسی زیناکار بە پیس (خبیث) ناودەبات و کە سێکیش دووربێت لە زینا بە پاك (طیب) ناویدەبات(النور – ٢٦).

کەواتە ئافرەتانی پاك بۆ پیاوانی پاك و پیاوانی پاك بۆ ئافرەتانی پاك، کەواتە ئەوە هەواڵی خوایە کە ئافرەت و پیاوی زیناکار پیسن.

١٧. سزای دوارۆژ چاوەڕوانی ئەوانەیە کە ماڵ و مناڵی خۆیان ناپرێزن لە ئاگر، کە ڕوونە زینا یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی چونە ناو ئاگر(التحریم – ٦).

١٨. هیچ کەس نییە حەزبکات ئەو کارە لەگەڵ نزیکەکانی بکرێت هەتا فاحیشەچی و زیناکارەکانیش: (إن فتیً شاباً أتی النبي ﷺ فقال: یارسول الله ائذن لي بالزنا.....)[٢].

---

١- صحیح جامع الصغیر و زیادته: ٣٠٦٩.

٢ مسند الإمام أحمد ٢١٨٣٦.

١٩. پەروەردگار مەدحی ئەوانە دەکات کە ئەو تاوانە ناکەن (التحريم – ١٢)، پەروەردگار کە باسی مەریەم دەکات لە دیارترین سیفەتە جوانەکانی ئەوەیە کە دامێنی خۆی پاراستووە.

٢٠. ئەو کەسەی ئەو تاوانە وازلێدێنی و تەرکی دەکات لەترسی خوای گەورە، وە دەشتوانێت بیکات لە ڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری خوای گەورەیە[١].

٢١. پەروەردگار مەدحی یوسف دەکات لەسەر وازهێنان و تەرککردنی زینا لەگەڵ ئەو هەموو هۆکار و پاڵنەرانەی کە هەبوون بۆ زینا کردن وەك:

- گەنجایەتی، چونکە گەنجایەتی بەهێزترین پاڵنەرە بۆ زینا.
- غەریبی چونکە غەریب ئەوەندە لێی دیار و عەیب نیە.
- ئەو بەندە بووە، بەندەش ناچاربووە فەرمانی گەورەکەی جێبەجێ بکات.
- بەرامبەرەکەی خاوەن پایە و جوان بووە.
- هەڕەشەی لێکراوە ئەگەر فەرمانەکەی جێبەجێ نەکات.
- دەرگاکانی لەسەر داخرابوون.
- خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی ئافرەتەکە بۆی.
- لەگەڵ هەموو ئەو پاڵنەرانەش تاوانەکەی نەکرد.

---

١ البخاري ١٤٣٢ - ٦٤٧٩ - ٦٨٠٦، مسلم ١٠٣١.

**٢٢.** ئەو كەسەی زمان و دامێنی خۆی بپارێزێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت من زەمان و مسۆگەربوونی چونە بەهەشتی دەكەم، (من يضمن لي ما بين لحييه و ما بين فخذيه، أضمن له الجنة)[١].

**٢٣.** ئەو كەسەی واز لە زینا دەهێنێت و تەركی دەكات پەروەردگار دەرووی خێری لێدەكاتەوە و بەڵاو ناخۆشی لەسەر لادەبات، وەك بەسەرهاتی ئەو سێ كەسەی كە پەنایان بۆ ئەشكەوت برد[٢].

هەموو ئەوانەی كە باسكران بەڵگەی زۆر ڕوونن لە شەریعەتی ئیسلام بە شێوازی جۆراوجۆر لەسەر خراپی و حەڕامی زینا.

---

١- البخاري: ٦٨٠٧، ترمذي: ٢٤٠٨، مسند أحمد: ٢٢٨٢٣.

٢- البخاري: ٣٤٦٥، مسلم: ٢٧٤٣.

# هۆکارەکانی زینا

بێگومان تاوانی زینا چەند هۆکارێکی جۆراوجۆری هەیە، کە ئێمە ئاماژە بۆ دیارترین و بەهێزترینیان دەکەین:

١. بێ دینی (الإلحاد).

٢. میدیا بە هەموو جۆرەکانیەوە.

٣. ئامرازە ئەلیکترۆنیەکان.

٤. تێکەڵاوی نێر و مێ بە بێ سنور.

٥. نەبوونی ئاسانکاری بۆ زەواج و گرانی و زۆری مارەیی.

٦. بیانوی تەواونەکردنی خوێندن.

٧. خۆ ڕوتکردنەوەی ئافرەتان.

٨. هاوڕێی خراپ.

٩. گۆرانی و مۆسیقای بێکەڵك (ماجن).

١٠. جادووکردن.

١١. نەرم و ناسکی نواندن لە قسەکردندا.

١٢. ڕێگری هەندێك لە ئافرەتان لە سەرجێی لەگەڵ پیاوەکانیان.

١٣. جێهێشتنی خێزان بۆ ماوەیەکی درێژ یان زیندانی کران.

١٤. مادده سڕکەر و هۆشبەرەکان.

١٥. دادوەر نەبوون لە نێوان خێزانەکان.

١٦. ڕێگری کەس و کار لە بە شودانی کچەکانیان بە بیانوی جیاواز.

١٧. كاتێك كچ نادرێت بە هاوشانی (هاوكوف)ی خۆی بەتایبەت ئەگەر تەمەنیان جیاوازی زۆر بێت.
١٨. داواكاری و تەكالیفی زۆری كەس و كاری كچ لە زاوا.
١٩. باش یەكتر نەبینینی كچ و كوڕ بۆ یەكتری.
٢٠. پشتگوێخستن و گوێ پێنەدانی دایك و باوك بە بەرگ و پۆشاكی كچ بە منداڵی.
٢١. ژینگەی خراپ.
٢٢. زیادبوونی شوێنی لەشفرۆشی و ئاساییكردنی لەبەر چاوی خەڵك.
٢٣. بەتەنیا بوونی كوڕ و كچ.
٢٤. زۆری تەڵاق.
٢٥. بێكاری و سەرقاڵ نەبوون بە شتی باش.
٢٦. بوونی خزمەتكاری بێگانە و نامەحرەم لە ماڵەكاندا وەك ئێستا بۆتە باو، وە دەمێكە لە وڵاتانی خەلیجی هەیە.
٢٧. گەشت و گوزار (سەفرە و سیاحە).
٢٨. هەژاری.
٢٩. سواڵكردن و ماڵانگەڕی.
٣٠. لێكجیا نەكردنەوەی كوڕ و كچ لە جێگای نوستن.
٣١. نەبوونی پلان لە پەروەردە و فێركردندا، یان بە پێچەوانەوە پلانی بۆگەن بۆ برەودان بەتاوانی زینا و تێكەڵاوی.

٣٢. چوونە ماڵان بە بێ ڕەچاوکردنی ئادابە ئیسلامیەکان.

٣٣. وەسفکردنی ئەوەی کە لە نێوان ژن و پیاو ڕوودەدات لە سەرجێی و گواستنەوەی بۆ کەسانی تر.

٣٤. بزوتنەوە فیمینزمییەکان.

٣٥. فەتوای خراپ و نابەجێ.

٣٦. جێبەجێ نەکردنی حوکمە شەرعییەکان.

٣٧. لاسایی کردنەوەی کوێرانە.

٣٨. داگیرکاری ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی.

٣٩. بیانو گرتن بە قەزا و قەدەر.

٤٠. جێبەجێ نەکردنی حوکمی شەرعی (الحدود).

٤١. ئاسانکاری یاسایی.

٤٢. زەواجی کاتی (المتعة).

## هۆکاری یەکەم: بێدینی و لاوازی ئیمان

گومان لەوەدا نییە کە پەروەردەی دینی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە بە بەهێزبوونی ڕەوشت و پابەندی بە بەها باڵاکان، لە چەندین ڕاپۆرتی زانستی و واقعیدا هاتووە کە ئیلحاد هۆکاری سەرەکییە بۆ تاوان و خۆکوشتن و ڕووکردنە ماددە هۆشبەرەکان و دەستدرێژی سێکسی و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و نەخۆشیە دەروونییەکان و پێکنەهێنانی خێزان و بەرگەنەگرتنی گرفت و کێشەکان.

شتێکی ڕوونە کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی نەبێت دەبێت چ شتێك بتوانێت بیگێڕێتەوە، لە کاتێکدا لە هەموو ئەوروپا زینا تاوان نییە و سزای لەسەر نییە، بەڵکو هەندێك لە وڵاتانی ئەورووپی زەواجی هاوڕەگەزیشیان بە یاسا کردووە، وە هەیە زەواجی مەحرەمەکانیشی (ئەو خزمانەی کە بەیەکتری نا شێن) بە ڕەوا داناوە.

دەتوانین بڕوانین بۆ ئەو خشتەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە ڕێگەیان بە زەواجی هاوڕەگەزی داوە، ئەو وڵاتانەی کەڕێگە بە زەواجی هاوڕەگەزی دەدەن:

| ژ | ناوی وڵات | ساڵ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | هۆڵندا | ٢٠٠١ | یەکەم وڵاتە لە ئەورووپا |
| ٢ | بەلجیکا | ٢٠٠٣ | دووەم وڵاتە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣ | ئیسپانیا | ٢٠٠٥ | |
| ٤ | کەنەدا | ٢٠٠٥ | یەکەم وڵات لە کیشوەری ئەمریکای باکور |
| ٥ | باشوری ئەفریقا | ٢٠٠٦ | یەکەم وڵات لە کیشوەری ئەفریقا |
| ٦ | نەرویج | ٢٠٠٩ | |
| ٧ | سوید | ٢٠٠٩ | |
| ٨ | پرتوگال | ٢٠١٠ | |
| ٩ | ئیسلەند | ٢٠١٠ | |
| ١٠ | ئەرجەنتین | ٢٠١٠ | یەکەم وڵات لە کیشوەری ئەمریکای باشور |
| ١١ | مەکسیك | - | لە ٢٠١٠ وە دەستپێدەکات تا ٢٠١٧ بە جیاوازی ویلایەتەکان |
| ١٢ | دانیمارك | ٢٠١٢ | |
| ١٣ | ئورۆگوای | ٢٠١٣ | |
| ١٤ | نیوزلەندا | ٢٠١٣ | |
| ١٥ | فەرەنسا | ٢٠١٣ | |
| ١٦ | بەرازیل | ٢٠١٣ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧ | شانشینی یەکگرتوو | ٢٠١٤ | لەئینگلتەڕا و وێڵز و سکۆتلەندا دانی پێدانراوە جگە لە ئێرلەندای باکور |
| ١٨ | لوکسمبورگ | ٢٠١٥ | |
| ١٩ | ویلایەتە یەکگرتووەکان | ٢٠١٥ | |
| ٢٠ | کۆڵۆمبیا | ٢٠١٦ | |
| ٢١ | فنلەندا | ٢٠١٧ | |
| ٢٢ | ئەڵمانیا | ٢٠١٧ | |
| ٢٣ | ماڵتا | ٢٠١٧ | |
| ٢٤ | ئوستوڕالیا | ٢٠١٧ | |

وە کار لەوە دەرچووە کە تەنها وڵات ڕێگەی پێدابێت بەڵکو ڕای گشتی بۆ جوڵێندراوە، بە پێی ئەم خشتەیە دەردەکەوێ کە ڕێژەی چەند هاوڕایە لەگەڵ هاوڕەگەزبازی وە چەند لەگەڵی نییە و چەند بێ هەڵوێستە لەگەڵ ناوی وڵات و سەرچاوەی ڕاپرسییەکە و ساڵەکەی.

خشتەیەك بۆ ڕونكردنەوەی ڕای گشتی لەسەر زەواجی هاوڕەگەزبازی:

| وڵات | دەزگای ڕاپرسی | ساڵ | لەگەڵ | دژ | نە لایەن |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەرجەنتین | ایبسوس | ٢٠١٥ | ٥٩% | ٢٦% | ١٤% |
| ئەرمینیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٥ | ٣% | ٩٦% | ١% |
| ئوستوڕالیا | ئیسانشل | ٢٠١٨ | ٦٥% | ٢٦% | ٩% |
| نەمسا | رسترش أفارز | ٢٠١٨ | - | - | - |
| باهاماس | ئەمریكا سپارومتر | ٢٠١٤ | ١١% | - | - |
| ڕوسیای سپی | ناوەندی بیو | ٢٠١٥ | ١٦% | ٨١% | ٣% |
| بلیز | ئەمریكا سپارومتر | ٢٠١٤ | ٨% | - | - |
| بەلجیكا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٨٢% | ١٠% | ٨% |
| بۆسنە و هەرسك | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ١٣% | ٨٤% | ٣% |
| بەڕازیل | داتافولها | ٢٠١٦ | ٤٥% | ٤٢% | ١٢% |
| پۆلیڤیا | ئەمریكا سپارومتر | ٢٠١٤ | ٢٢% | - | - |
| بولگاریا | ناوەندی بیو | ٢٠١٥ | - | - | - |
| كەمبۆدیا | تی ئێن ئێس | ٢٠١٥ | ٥٥% | ٣٠% | ١٥% |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کەنەدا | سی ئارِ ئۆ بی | ٢٠١٧ | ٧٤% | ٢٦% | - |
| تتنیلی | بلازا بویلکا | ٢٠١٨ | ٦٥% | ٣٢% | ٣% |
| كولۆمبیا | کادم | ٢٠١٨ | ٤١% | ٥٦% | ٣% |
| كۆستاریكا | سی ئەی ئی بی | ٢٠١٦ | ٤٥% | ٤٩% | ٦% |
| كرواتیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ٣١% | ٦٤% | ٥% |
| قبرس | یوروبارومتر | ٢٠١٥ | ٣٧% | ٥٦% | ٧% |
| چیك | سی فی فی ئام | ٢٠١٨ | ٥٠% | ٤٥% | ٥% |
| دانیمارك | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٨٦% | ٩% | ٥% |
| دۆمۆنیكا | سي دي ئین | ٢٠١٨ | ٤٥% | ٥٥% | - |
| ئیكوادۆر | ئەمریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١٦،٥% | - | - |
| سلفادور | ئەمریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١٤% | - | - |
| ئیستۆنیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٣٩% | ٥٢% | ٩% |
| فنلەندا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٦٤% | ٢٦% | ١٠% |
| فەرەنسا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٧٣% | ٢٣% | ٤% |
| جۆرجیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ٣% | ٩٥% | ٢% |
| ئەڵمانیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٢٣% | ٢٠% | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| یۆنان | دیانیوسس | ٢٠١٦ | ٥٠% | ٤٧% | - |
| گواتیمالا | ئەمریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١١% | - | - |
| گۆیانا | ئەمریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٨% | - | - |
| هایتی | ئەمریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٧% | - | - |
| هیندۆراس | سی ئەی دی غالوب | ٢٠١٨ | ١٧% | ٧٥% | ٨% |
| هەنگاریا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ٢٧% | ٦٤% | ٩% |
| ئایسلەندا | مؤسسة غالب | ٢٠١٤ | ٨٧% | - | - |
| ئیرلەندا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٦٦% | ٢٧% | ٧% |
| ئیسرائیل | القناة العاشرة | ٢٠١٨ | ٥٨% | - | - |
| ئیتاڵیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٥٩% | ٣٨% | ٣% |
| جامایكا | ئە مریكا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٥% | - | - |
| یابان | ئیتش كای | ٢٠١٧ | ٥١% | - | - |
| كازاخستان | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | - | - | - |
| لاتفیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ١٦% | ٧٧% | ٧% |
| لیتوانیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ١٢% | ٨٥% | ٣% |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لوکسمبورگ | یوروباروметр | ٢٠١٥ | ٧٥% | ٢٠% | ٥% |
| مالتا | بینرنز لیدز مالتا | ٢٠١٦ | ٦١% | - | - |
| مەکسیك | غایبنتیدی دی کومیز کاسیون استراتیجیکا | ٢٠١٦ | ٦٩% | ٢٥% | ٦% |
| مولدوفا | ناوەندی بیو | ٢٠١٥ | ٥% | ٩٢% | ٣% |
| هۆڵندا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٨٦% | ١٠% | ٤% |
| نیکالاگوا | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١٤% | - | - |
| نەرویج | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٧٢% | ١٩% | ٩% |
| نیوزلەندا | وان نیوز کوکاربرنتن | ٢٠١٢ | ٦٣% | ٣١% | ٥% |
| پەنەما | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٢٥% | - | - |
| پاڕاگوای | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٢١% | - | - |
| پیرۆ | سی بی ئەی | ٢٠١٧ | ١٣% | ٨٢% | ٤% |
| پۆڵندا | سی بی ئۆ ئێس | ٢٠١٧ | ٣٠% | ٦٤% | ٦% |
| پرتوگال | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٥٩% | ٢٨% | ١٣% |
| ڕۆمانیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٥ | ٢٦% | - | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕوسیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ٥% | ٩٠% | ٥% |
| صربیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ١٢% | ٨٣% | ٥% |
| سەنگافورە | ئۆ ئێس سی | ٢٠١٣ | ٢١% | ٥٥% | ٢٤% |
| سلۆڤاکیا | فوکدس | ٢٠١٦ | ٢٧% | ٦٩% | ٤% |
| سلۆڤینیا | نیامیدیا | ٢٠١٥ | ٣٨% | ٥٠% | ١٢% |
| ئەفریقای باشور | ئەتیش ئاڕ ئێس سی | ٢٠١٥ | ٣٧% | ٤٦% | ١٧% |
| کۆریای باشور | غالوب کوریا | ٢٠١٧ | ٤١% | ٥٢% | ٦% |
| ئیسپانیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٧٧% | ١٣% | ١٠% |
| سورینان | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١٨% | - | - |
| سوید | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٨٨% | ٧% | ٥% |
| سویسڕا | ناوەندی بیو | ٢٠١٧ | ٧٥% | ٢٤% | ١% |
| تایوان | تایوان سارشل | ٢٠١٥ | ٥٤% | ٣٧% | ٩% |
| تایلەند | نیدا بدل | ٢٠١٥ | ٥٩% | ٣٥% | ٦% |
| ترینداد تۆباگۆ | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ١٦% | - | - |
| ئۆکرانیا | ناوەندی بیو | ٢٠١٦ | ٩% | ٨٥% | ٦% |
| شانشی یەکگرتووUK | ئیبسوس | ٢٠١٨ | ٧٣% | ٢١% | ٦% |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ویلایەتە یەکگرتووەکان | ڕێکخراوی غالوب | ٢٠١٨ | ٦٧% | ٣١% | ٢% |
| ئۆرۆگوای | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٧١% | - | - |
| فەنزوێلا | ئەمریکا سبارومتر | ٢٠١٤ | ٣٠% | - | - |
| ڤێتنام | ئەی ئێس ئی ئەی | ٢٠١٤ | ٣٤% | ٥٣% | ١٣% |

لەم خشتەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لەو وڵاتانەی بێدینی پەرەی سەندووە نەك تەنها زینا بەڵکو ڕێژەی تاوانی هاوڕەگەزبازیش بڵاوبۆتەوە، هۆکارەکەش ڕوونە چونکە بێدینی وا لە مرۆڤ دەکات بڕوای بە دوارۆژ و لێپرسینەوەی خوایی نەبێت، لە هەموو جیهاندا لە چەند وڵاتێکی کەم نەبێت زینا بە تاوان نازاندرێت تاکو سزای بۆ دابندرێت، لە یاسای سزای عێراقیش تەنها ناپاکی هاوسەری (خیانەی زەوجی) بە تاوان دادەندرێت بە مەرجێك هاوسەرەکەی سکاڵا بەرزبکاتەوە ئەویش بەچەند مەرجێك.

## هۆكاری دووەم: میدیا بە بینراو و بیسراو و خوێندراوە

گومان لەوەدا نیە كە میدیا بە هەموو بەشەكانیەوە ڕۆڵێكی كاریگەر دەبینێت لەو بوارەدا هەتا وای لێهاتووە پێی بگوترێت دەسەڵاتی چوارەم، بەڵام لەڕووی كاریگەری و فیكری و پەروەردە و كارلێكردنی چاك و خراپ لە زۆربەی سێكتەرەكانی ژیاندا وای لێهاتووە كە بووەتە دەسەڵاتی یەكەم ڕۆژانەش ئەم بوارە لە پەرەسەندن دایە، وە بەداخەوە زۆربەی كات بۆ خراپە بەكاردەهێندرێت.

**ڕۆڵی كتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە:**

بێگومان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەیان بگرە سەدان كتێب نوسراوە بە دەستی كەسانێك كە هیچ بەهایەك بۆ ڕەوشت و دینی خەڵك دانانێن، دەیان چیرۆك و ڕۆمانی خەیاڵی و درۆیینە بۆ جورئەتدان بەگەنج بۆئەوەی كە حیساب بۆ هیچ شتێك نەكات مادام دەیەوێ ئازاد و ئازا و چاوكراوە بێت وە ببێتە پێشەنگ لە كۆمەڵگەدا، بگرە خەڵاتكردن و هاندانی گەرم لەلایەن هەندێك ڕێكخراو و دەزگاوە ڕێگایان بۆ ئاسان كردوون، تەنانەت هەندێك لەوانە برەودان بە بەدڕەوشتی دەكەنە وەسیلە و هۆكاری خۆژیاندن و بەناوبانگ بوون وە بۆ وەرگرتنی ئیقامە و رەگەزنامەی وڵاتان ئەم كارە دەكەن[١].

---

١- الزنا تحريمه – أسبابه و دوافعه – نتائجه آثاره : دندل جبر: لا (١١٠ – ١١٣).

بەکارهێنانی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە لەسەرەتای سەدەی ڕابردوو بۆ جیهانی ئیسلامی دەستی پێکرد، لە نیوەی دووەم بەهۆی ڕژێمە عەلمانی و دۆڕاوەکان لەسەروویانەوە لوبنان و میصر و تورکیا سنوری بەها باڵاکان شکێنران و بەشێکی زۆر لە داهاتی وڵات بۆ ئەم مەبەستە سەرف دەکرێ.

بێگومان کە بمانەوێ باسی نوسەر و ناوی رۆژنامە و گۆڤارەکان بکەین چەندین کتێبی سەربەخۆی پێویستە، بابەتەکە ئەوەندە ڕونە پێویست بە بەڵگە ناکات وەکو شاعیر دەڵێت:

وليس يصح في الأذهان شيء

إذا احتاج النهار إلى دليل

واتا:

هیچ ژیریەك لە کەللەدا نییە

کاتێك ڕۆژ پێویستی بە بەڵگە بێت

**ڕۆڵی تەلەفیزیۆن و کەناڵە ئاسمانییەکان:**

ئەوەش هەر زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەم لە سەدەی ڕابردوو، بەتایبەت لە هەزارەی سێیەم زۆر پەرەی سەند کە لەم ڕۆژەدا ژمارەی کەناڵە ئاسمانییەکان لە هەزاران تێپەڕی و زۆربەشیان ئامانجی تێکدانی بیروباوەڕ و ڕەوشتە. شاعیر دەڵێت:

متى يبلغ البنيان يوما تمامه

إذا كنت تبنيه و غيرك يهدم

ولو ألف بانٍ خلفهم هادم كفى

فكيف ببانٍ خلفه الف هادم

واتا:

چۆن چاوەڕێی ڕۆژێكی كە بینا و كۆشك تەواو ببێ

لە كاتێكدا كەتۆ دروستی دەكەی یەكێك لە دوای تۆ دەیڕوخێنێتەوە

ئەگەر هەزار كەس دروستكەری بینایەك بن یەك كەس تێكدەربێت بەسە

ئەی دەڵێی چی ئەگەر یە ك كەس بنیادنەر (وەستا) بێت و هەزار

كەس لەپشتیەوە ڕوخێنەر بن.

بەتایبەتی كاریگەری تەلەفیزیۆن بەسەر منداڵاندا یەكجار زۆرە، لە وڵاتێكی وەكو ئەمریكا منداڵ ڕۆژانە ٥ – ٦ كاتژمێر سەیری تەلەفیزیۆن دەكات ساڵانە ١٥٠٠٠ كاتژمێر دەڕوانێت بۆ تەلەفیزیۆن لە كاتێكدا ١٣٥٠٠ كاتژمێر لە قوتابخانە و دایانگە بەسەر دەبات[١].

لە كاتێكدا تەلەفیزیۆن كاریگەری زۆر خراپی هەیە لە بواری:

١. لاشە كە بێهێز و لاواز و كەم جوڵەی دەكات.

٢. واجبەكانی قوتابخانە و ماڵەوە پشتگوێ دەخەن.

٣. تەلەفیزیۆن منداڵ فێری ڕەوشتی نەرێنی (سلبي) دەكات.

---

١- دراسات في الإعلام الإسلامي: مصطفى بن أحمد كناكر، بەرگ ٤، ل (٩٩ – ١٠٠).

٤. بینینی فیلمی توند و تیژی و ترسناك منداڵ توشی کێشەی دەرونی قوڵ دەکات.

٥. بینینی فیلمی سێکسی و وروژاندن کە منداڵ شتی وا دەبینێت هیچ کات بە خەیاڵیدا نەهاتووە.

٦. لاساییکردنەوەی ئەو جوڵە هەڵانەی کە دەیانبینێت لە شاشە، کە زۆر جار قوربانی گەورەی لێکەوتۆتەوە.

٧. گرینگی نەدان بە لایەنی زمانەوانی کە منداڵ زۆر لە ڕووی زمانەوانییەوە دادەبەزێنێت بۆ ئاستی زۆر زۆر عامی و نەخوێندەواری.

٨. زۆربەی بەرنامەکان هی وڵاتان و کۆمەڵگاکانی ترن، بۆ وڵاتی ئێمە ئامادە نەکراون[١].

بێگومان ئافرەتانیش کاتێکی زۆر بەسەر دەبەن بەدیار کەناڵە ئاسمانییەکان، ئامارەکان لەهەموو دونیا ئەوە دەردەخەن کە کاریگەری زۆر خراپی هەبووە بەتایبەت لە بواری:

١. **ئابوری:**

کە ئافرەتان زۆربەی کات بەو مۆدێلانە کاریگەرن کە دەیان بینن یان دیزایینی خان و بەرە و حەوشە و پێویستیەکانی جل و بەرگ و چێشتخانە و بوارەکانی تریش، لە کاتێکدا ئەمانە جێبەجێ نابن یان دەبێتە خەمێکی قوڵ لەناخیدا کە توشی خەمۆکی و بێتاقەتی دەکات.

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل (١٠٤ – ١١٠).

**٢. کۆمەڵایەتی:**

بێگومان کاریگەری زۆر ئاشکرای هەبووە لەسەر ڕوودانی جیابوونەوە یان فێربوونی خیانەتی سەرجێی، بەتایبەت کە دەبینین مرۆڤە ناپاك و چەپەڵەکان دەکرێن بە پاڵەوانی فیلمەکە و لای بینەر خۆشەویست دەکرێن بە هەموو شێوەیەك ناپاکی هاوسەری (الخیانه الزوجیة) نەك هەر ئاسایی نیشاندەدرێ بەڵکو زۆریش جوان دەکرێ.

**٣. سیاسی:**

زۆر دەبینین بەتایبەت کەناڵە زەبەلاحەکان و پارەدارەکان چۆن بازاڕ بۆ خراپە خۆشدەکەن خەڵك چەواشە دەکەن و دەیگەوجێنن و ڕای گشتی بە ئاراستەی ناحەق دەگۆڕن و بەکاردەهێنن، دەبینین خیانەتی سەرکردەکان وەك داستان وێنا دەکرێت و شەوە ڕەشەکانیان بە شۆڕش دەناسێندرێت و گەندەڵی و دزیان بە بازرگانی و گەورە و سەر ڕاستی لەقەڵەم دەدرێ، دکتاتۆرییان بۆ دەکرێ بە دیموکراسی و...هتد.

**٤. پەروەردە و فێرکردن:**

زۆر بەڕوونی دیارە کە ئاستی گەنجان و هەرزەکاران و منداڵان زۆر دابەزیوە لە هەردوو بواری خوێندەواری و ڕەوشت.

## هۆکاری سێیەم: ئامرازە ئەلیکترۆنیەکان

بێگومان ئەوەی بەکاردێت لەئامێرەکان زۆرن، بەڵام لە هەمووی گرینگتر:

١. ئینتەرنێت.

٢. موبایل.

### ئینتەرنێت:

بێگومان ئەم بوارانەی لەمڕۆدا پەیدادەبن لە بواری پێشکەوتنی مرۆڤایەتی چەکێکی دوو سەرن بە چاك و خراپ بەکاردێن.

ئەمڕۆ ئینتەرنێت بووەتە دەزگایەك یاخود ئامێرێك زۆربەی مرۆڤایەتی سودی لێوەردەگرێت لە هەموو بوارەکانی ژیان بۆ پەیوەندی کردن، گەیاندن، بازرگانی، بانگەواز، خۆناساندن، زەواجکردن، دروستکردنی حزب و ڕێکخراو، بڵاوکردنەوەی زانیاری هەمەجۆر، فریاکەوتنی هەژاران و نەخۆشان، زیادبوونی ڕۆشنبیری لە کۆمەڵگادا ڕێگایەکە بۆ خوێندن و چەندین زانکۆ و پەیمانگای تێدا دانراوە و کەسەکان دەبنە خاوەن بڕوانامەی جۆراوجۆر، چاکیەکانی لە ژمارە نایەن بۆیە پێویستە بە یاسا و ڕێسا ئەو بوارانە ڕێکبخرێن یان لانی کەم دەزگا پەیوەندی دارەکان ڕۆشنبیری تەواو بدەن لەسەر زیان و قازانجەکانی، کە بێگومان ڕۆشنبیری لەسەر بڵاودەکرێتەوە، بەڵام لە هەرێمی کوردستان یاسا و ڕێسای پێویست نییە لەو بوارەدا.

## موبایل:

بێگومان موبایل بووەتە ئامێرێکی گرینگ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا و مرۆڤ وای لێهاتووە کە ناتوانێت دەستبەرداری ئەم ئامێرە ببێت، چونکە کارەکانی ڕایی نابێت یان سست دەڕۆن، بۆیە ئەم ئامێرەش چەکێکی دووسەرە بە چاك و خراپ بەکاردێت، بەڵام بەداخەوە وەکو کەناڵە ئاسمانییەکان زۆربەی کات لە خراپە و هەڵتەکاندنی خێزاندا بەکاردێت، بۆیە ئەو کەسەی کە موبایل بەکاردێنێت مادام خۆی بە کەسێکی پابەند بە شەرع دەزانێت با ئەم ئادابانە ڕەچاو بکات:

١. بە سەلامکردن دەستپێبکات تا وای لێدێ ببێتە نەریتێکی جوان لە کۆمەڵگای مسوڵمانانداا لەجیاتی ئەلو کە تەنها بۆ ئاگادارکردنەوەیە و هیچی تر، تۆ کە بڵێی: السلام علیکم، (١٠) دە چاکەت بۆ دەنوسرێت.

٢. لە کاتی نوستن و پشوودان تەلەفۆن نەکرێ.

٣. لە کاتی چوونە ناو مزگەوت و چوونە ناو نوێژ بەکارنەهێنرێت، یان لەو شوێنانەی کە دەڵێت بەکارهێنانی قەدەغەیە.

٤. ئەگەر جارێك زەنگت لێدا چاوەڕێکە و یەکسەر دووبارەی مەکەوە.

٥. زەنگێکی وا دابنێ لەسەر موبایلەکەت کە شەرعی بێت.

٦. بە هەڵە ژمارە تەلەفۆن بەکارمەهێنە، بۆیە خۆت دڵنیاکەوە لە ڕاستی ژمارەکە.

٧. نیوە زەنگ (نوکە جەڕەس) بەکار مەهێنە مەگەر لەکاتی پێویستیدا یان یەکە (وەحدە)ت لا نەمابێت.

٨. قسە و گفت و گۆی بێسود مەکە و بەخۆڕایی کاتت لە خەڵك بەزایە مەدە.

٩. تەلەفۆن مەکە بە بێکاری و کەسەکە بێزار مەکە بە قسەی بێسوود، وەکو بڵێی: دەمناسی؟ چۆن نازانی من کێم؟! دەوڵەمەند بووی نامناسیەوە یان فەقیران ناناسی .... بەتایبەت ئەو وشانە کە بەرامبەر نیگەران و بێزار بکات وا چاکە یەکسەر خۆت بناسێنی، دەبینی ئەو مەجالی نییە یان کاتەکەی نەگونجاوە.

١٠. لە کاتی سەیارە لێخوڕین موبایل بەکارمەهێنە، چونکە زۆربەی هۆشی مرۆڤ دەبات و خۆت و خەڵکیش توشی کارەسات مەکە.

١١. با موبایلەکەت وێنە و شتی بێشەرعی تێدا نەبێت.

١٢. ئایەت و قورئان و بانگدان و شتە ئایینیەکان لەسەر زەنگی موبایلەکەت دامەنێ.

١٣. موبایلەکەت لە دەستی منداڵدا نەبێت وێڕای ئەوەی کە زیانی هەیە بۆی لەوانەیە خەڵکی بێزار بکات بە لێدانی ژمارەیان.

١٤. دەنگی خەڵك تۆمار مەکە بە بێ پرسی خاوەنەکەی ئەگەرنا دەچێتە بابی جاسوسی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾ [الحجرات: ١٢].

١٥. دوای تەلەفۆن موبایلەکەت قوفڵ بکە بۆئەوەی دەستت بەرنەکەوێت.

١٦. ئەگەر لەناو نوێژدا بووی زەنگت بۆ هات و لەبیرت نەبوو پێشتر دایبخەی، دایبخە نوێژەکەت نابڕێ.

١٧. موبایلی كەس بەكارمەهێنە بە بێ مۆڵەتی خاوەنەكەی.

١٨. ئەگەر ناچاربووی لەناو كۆڕ و مەجلیسێكدا موبایل بەكاربهێنیت، زۆر ڕەچاوی بەرامبەرەكانت بكە و دەنگت نزم بكە.

١٩. مۆبایل بۆ خۆدەرخستن و شانازیكردن نەبێت، وەك ئەوەی خۆت دەوڵەمەند نیشان بدەی یان وەك زانا و بەرپرس، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (المتشبع بما لم يعط كلابس ثوب زور)[1].

٢٠. لە كاتی قسەكردن هەست بكە كە خوای گەورە چاوی لێتە و چاودێریت دەكات وە فریشتەكان وتەكانت تۆمار دەكەن.

٢١. سوپاسی خوای گەورە بكە لەسەر ئەو نیعمەتەی كە لەبەر دەستتدایە، سوننەتە لە بەیانیان و ئێواران مرۆڤی مسوڵمان بڵێت: (اللهم ما أصبح أو أمسى بي من نعمة)[2].

٢٢. بە دەنگی نزم قسە بكە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ١٩﴾ [لقمان: ١٩].

٢٣. لەناو كۆڕ و مەجلیسدا ئەگەر ناچاربووی تەلەفۆن بكەی ڕوخسەت و مۆڵەت وەربگرە: (ليس منا من لم يرحم صغيرنا و لم يوقر كبيرنا)[3].

---

١- المسلم: ٢١٢٩.

٢- أبو داود: ٥٠٧٣.

٣- أبو داود: ٤٨٤٢.

٢٤. ئەگەر دوو کەس بوون بەیەکەوە ئەوە نابێت بە پستە پست و چرپە چرپ قسە بکەن، چونکە ئەوەی تر گومان لە خۆی دەکات، یان ئەگەر ناچاربوو با داوای مۆڵەتی بکات و دڵنیای بکاتەوە کە دەربارەی ئەو قسەیان نەکردووە، وە ئەگەر سێ بوون نابێت دوویان بە جیا لە کەسی سێیەم قسە بکەن چونکە لە فەرموودەدا هاتووە: (إذا كنتم ثلاثة فلا يتناجى اثنان دون الآخر فإن ذلك يحزنه)[١].

**لایەنە باشەکانی موبایل:**

١. دەتوانی زۆر بەئاسانی لە کاتێکی کەمدا بۆ هەر شوێنێك بتەوێت پەیوەندی بکەی و لەگەڵ خزم و کەس و دۆستان و هەواڵیان بپرسی و لێیان ئاگادار بیت.

٢. گەڕانەوەی کاتێکی زۆر.

٣. هۆکارێکی خێرای گواستنەوەیە لە ناو خەڵکیدا.

٤. بە ماوەیەکی کەم دەتوانی سیلەی ڕەحم لەگەڵ خزم و دۆستان بەجێ بگەیەنیت.

٥. لە کاتی پێویست و لێقەوماندا دام و دەزگا و خزم و دۆستان بەخێرایی ئاگادار دەکەیەوە.

---

١- صحيح مسلم: ٢١٨٤، ترمذي: ٢٨٢٥، ابن ماجه: ٣٧٧٥.

٦. دەتوانێت ڕۆڵێکی گرینگ ببینێت لە پاراستنی ئاسایشی وڵات بە هەواڵدان لە کەسی گومان لێکراو و خراپەکار.

٧. بووەتە هۆکارێکی گرینگ بۆ بازرگانی کردن.

٨. دەتوانێت پارە و پول و کات بگێڕێتەوە بۆ هاولاتي.

٩. هۆکارێکی باشە بۆ ئاگادرکردنەوە لە کاتی نوێژ وە بۆ بەخەبەرهاتن.

١٠. ئامێرێکی گرینگە بۆ دانانی قورئان و زیکر و دوعا، چ بۆ خوێندنەوە چ بۆ گوێگرتن.

١١. دەتوانیت شتە بەسودەکان وەك وتا و موحازەرە بگوازیەوە بۆ کەسانی تر.

١٢. کامێرایەکی کەم مەسرەف و خێرایە بۆ وێنەگرتن و پاراستنی یادگاریەکان.

١٣. کاتژمێرە بۆ کاتەکان.

١٤. ژمێریارێکە(الحاسبة) بۆ لێکدانەوە و ژمێریاری.

١٥. دەتوانی بۆ ڕوناکی سودی لێوەربگری.

١٦. ئەرشیفە بۆ هەڵگرتنی شتی تایبەتی خۆت.

١٧. هۆکارێکی بەهێزە بۆ پرسیار و وەڵامی شەرعی لە ناوەوە و دەرەوە.

١٨. دەتوانرێت بکرێتە هۆکارێکی بەهێز بۆ دەعوە و بانگخوازی.

١٩. ساڵنامە و ڕۆژمێرە بۆ کاتەکان وەك ساڵ و مانگ ڕۆژ.

٢٠. هێڵێکی ئینتەرنێتی و بزۆکە کە دەتوانیت بۆ هەموو جێگایەك ببەیت.

٢١. لە هەڵگرتندا سوکە و قەبارەی کەمە، کە دەتوانیت چەند موبایلێکی بەکاربێنیت ئەگەر پێویست بێت[١].

---

١- گەنجان لە نێوان گرفتی سەردەم و چارەسەردا: د. إدریس کاریتانی، ل (١٥٧ – ١٦٣) بە کەمێك دەستکارییەوە.

## هۆکاری چوارەم: تێکەڵاوی نێر و مێ

یەکێك لە هۆکارە بەهێزەکانی توشبوون بە زینا و داوێنپیسی تێکەڵاو بوونی نێر و مێیە بەبێ پێویستی و زیاد لە سنوری خۆی، پەروەردگار ئەم دوو ڕەگەزەی وا دروستکردووە کە زۆرترین کاریگەریان لەسەر یەکتر هەیە و بەبێ یەکتری ناژین، بە هەردووکیان ژیان تەواودەکەن و ڕۆڵی هەردووکیان تەواوکاری (التكامل)یە، دژ بە یەك نین وەك هەندێك جوڵانەوە و ڕێکخراوی فیمینیزمی وای نیشاندەدەن و وێنای دەکەن. ئەگەر غەریزەی خۆشەویستی لە ناخی ئەم دوو ڕەگەزە بۆ یەکتری نەبووایە، ئەوا ژیان بەردەوام نەدەبوو، نەك هەر لە نێوان مرۆڤەکان بەڵکو لە نێوان زیندەوەرانیشدا، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤﴾ [آل عمران: ١٤].

خۆشەویستی مرۆڤ بۆ هاوسەر و منداڵ و ماڵ و ئەسپ و سەیارەی جوان غەریزە و پاڵنەرێکە لە ناخی مرۆڤدا چێنراوە، ئەگەر خۆشەویستی بۆ ئەو شتانە نەبێت مرۆڤ هەوڵیان بۆ نادات، ئەو کات کۆتایی بە ژیان دێت و ئەوە پێچەوانەی ویستی خوایە، کە دەیەوێت زەوی بە مرۆڤ ئاوەدان بکاتەوە وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ

قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [البقرة: ٣٠].

کەواتە ئادەم لە زەوی دروست بووە و بۆ زەوی دروست بووە و دەبێت زەوی ئاوەدان بکاتەوە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ﴿٦١﴾﴾ [هود: ٦١].

لە سەرەتای ئەم کتێبەشدا ئاماژەمان بەوەدا کە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم شەریعەتە ئاوەدانکردنەوەی زەوییە، هەر هەوڵێکیش بە پێچەوانەی ئەمە دژایەتی کردنی ئامانجی ئەم شەریعەتەیە، ئەم مرۆڤە لەم دوو ڕەگەزە پێکهاتووە بۆیە پەروەردگار یاسا و ڕێسایەکی زۆری داناوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی ئەم دوو ڕەگەزە، چونکە ئەگەر بە یاسا ڕێکنەخرێ ئەوا ژیان وێران دەبێت.

یەکێك لە بەهێزترین هۆکارەکانی زینا تێکەڵاوی بێسنوری ژن و پیاوە، واتا ئەم دوو ڕەگەزە ئەمڕۆ تێکەڵاوی زۆر بووە ئەمەش بە هۆکاری جۆراوجۆر لە ڕەوزەوە بگرە تاکو باڵاترین دەزگا لە حکومەت هەمووی بە شێوازی تێکەڵاوییە، ئەمە ڕاستییەکە حاشای لێناکرێ و ڕێی پێناگیرێ خوێندکارێك لە خوێندنی بنەڕەتییەوە تاکو ئامادەیی و تاکو زانکۆ لە خوێندنی ماستەر و دکتۆراش هەر تێکەڵاوییە، لە ڕاستیشدا شەریعەت نەهاتووە پێمان

بڵێت نابێت ئەم دوو ڕەگەزە لە هیچ شوێنێك تێکەڵاو بێت، چونکە ئەمە لە زەمانی سەروەری مرۆڤایەتیش هەر نەبووە، وە لە سەدە زێڕینەکانیش نەبووە، ئەگەر بمانەوێ بەڵگە بۆ ئەوە بهێنینەوە بەتەنیا کتێبێکی دەوێت، بۆیە ئەوانەی بەناوی زانا و بانگخواز و دڵسۆز بۆ ئیسلام وا نیشاندەدەن کە ناکرێت بە هیچ شێوەیەك تێکەڵاوی ئەم دوو ڕەگەزە هەبێت، لە ڕاستیدا نەزانن بە دین و ژین.

با لە چەند خاڵێکدا بابەتی تێکەڵاوی یان ئادابەکانی تێکەڵاوی باس بکەین، بۆئەوەی نەبێتە هۆکاری زینا پێویستە ئەو ئادابانە لە کاتی تێکەڵاویدا ڕەچاوبکرێن:

١. هەتا دەکرێ بەریەککەوتنی ژن و پیاو نەکرێ بە بێ پێویستی، چونکە ئەم دوو ڕەگەزە سەرنجڕاکێش و کاریگەرن لەسەر یەکتری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ٣٣﴾ [الأحزاب: ٣٣]. بە دایکی ئیمانداران بڵێ باخۆیان داپۆشن، ئەوە تەنها بۆ ئەوان نیە، بەڵکو گشتیە بۆ هەموو کەس بەتایبەتی ئەوان.

٢. ڕەچاوی باڵاپۆشی بکرێت، چونکە خۆڕانواندنی ئافرەتان بە شێوەی ڕوت یان نیمچە ڕوت کارەساتی لێدەکەوێتەوە.

٣. هەتا دەکرێت هەوڵبدرێت کە شوێنی پیاوان و ئافرەتان جیا بێت، بۆنمونە لە چێشتخانە و شوێنی قەرەباڵغ بە پێی توانا.
٤. ئافرەتان با قسەکردنیان بە ناسکی و نەرمی و سەرنجڕاکێشی نەبێت.
٥. هەتا دەکرێت لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا بێت لانی کەم کەسێکی لەگەڵدا بێت با منداڵیش بێت.
٦. بەرگ و پۆشاکی سەرنجڕاکێش بەکارنەهێندرێت.
٧. خۆیان لابدەن لە پیاوانی خەراپ و چاولەدەر، ئەمە بۆ پیاوانیش هەر ڕاستە بە تایبەت ئەوانەی کە خاوەنی کۆمپانیا و مارکێتن.
٨. لە سەرووی هەموو شتێکەوە خوای گەورە بە چاودێر و موراقیب بزانن.
٩. خۆپاراستن لە (تحریش) وروژاندن و ئیحراجکردنی بەرامبەر بەدەست و بەچاو وە بەهەر شێوەیەك، چونکە تەحریش جۆری زۆرە.

**تەحریش لەکوێ ڕوودەدات:**

أ- لە بازاڕ و شەقام.
ب- لە شوێنی کار.
ت- لە شوێنی دراسە و خوێندن.
ث- لە ڕێگا و بان و ناو فڕۆکە و پاس...
ج- شوێنی نان خواردن و چێشتخانە.
ح- هەتا لەماڵیش لەگەڵ ناسیاو و خزمان.
خ- بەهۆی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانەوە.

**خراپترین جۆرەکانی وروژاندن (تحریش):**

١. وتنی وشەیەك بە شێوەی نەرم و ناسکی و جوڵاندنی بەرامبەر وەك توانجگرتن لە شوێنێکی بەرامبەر.

٢. وروژاندنی جەستە بە دەستلێدان و چاولێداگرتن و پێکەنین و هەرجۆرێکی تری وروژاندن.

٣. ڕاوەستان لە نزیك کەسی بەرامبەر کە دەبێتە مایەی بێزارکردنی کەسی بەرامبەر.

٤. چاوبڕین لە شوێنێکی بەرامبەر.

٥. وروژاندنی دەنگی بە شێوەیەك بەرامبەر تێبگەیەنێت، بۆ نمونە فیکەلێدان.

٦. شوێنکەوتنی بەرامبەر و بەدواداچوونی لە شوێنەکان و ناو سەیارە و پاڕك و هەر شوێنێك بۆی بچێت شوێنی بکەوێت و بێزاری بکات.

٧. وروژاندن لە ڕێی تەلەفۆن و ئینتەرنێت و ئامێرەکانی تر.

٨. وروژاندن لە ڕێی ناردنی وێنەی ڕوت و بێزارکەر.

٩. وروژاندن بە شێوەی خۆڕوتکردنەوە و نیشاندانی شوێنی نەشیاو.

١٠. بێزارکردن بەهۆی داواکردنی ژمارە مۆبایل.

١١. بانگکردنی بۆ نانخواردن و چاخواردنەوە و شتی تر کە کەسی بەرامبەر بێزار بکات.

١٢. داواکردنی خۆناساندنی بەرامبەر و زیادەڕەوی کردن لەو داوایە بە ئیلحاح و زۆری لێکردن.

١٣. هەڕەشەکردن و وروژاندن لە لایەن کەسە دەسەڵاتدارەکان بۆ کەسانی بێدەسەڵات و سقیل.

١٤. جاری وا هەیە ئەو وروژاندنە بە کۆمەڵ ئەنجامدەدرێت وەکو ئەوەی کۆمەڵە گەنجێك بەیەکەوە لە پاڕکەکان یان لەسەر ڕێگاکان یان لە ناو سەیارە و شەقامەکان خەڵك بێزار بکەن.

## هۆكاری پێنجەم: لەمپەر دانان لە بەردەم زەواج

یەكێك لە هۆكارەكانی پەیدابوونی زینا و پەرەسەندنی لەمپەرخستنە بەردەمی زەواج و ئاسانكاری نەكردنە بۆی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٣٢﴾ [النور: ٣٢].

پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕووی لە كۆمەڵگای مرۆڤایەتییە كامەیان دەسەڵاتی زۆرتر بێت بەرپرسیاریەتی زۆرترە، (الأيامى) كۆی (أيِّم)ە، أيم: بە كەسێك دەگوترێت لە پیاوان و ئافرەتان كە خاوەنی هاوسەر نەبێت جا پێشتر هاوسەرگیری كردبێت یان نا[١].

هاوسەرگیری یەكێك لە پێنج حوكمەكانی بەسەردا دەبڕێت ئەوە بێجگە لەوەی كە پێویستە ئەم پڕۆسەیە لە ناو خەڵكدا هەبێت و ڕانەوەستێت، چونكە بە شێوەیەكی گشتی واجبە زەواج هەبێت.

ئاسانكاری نەكردن بۆ هاوسەرگیری و لەمپەر دانان لە بەردەمی یەكێكە لە هۆكارە هەرە دیار و كاریگەرەكانی زۆربوونی تاوانی زینا. دەكرێت ئێمە چەند هۆكارێك لەبەر چاو بگرین لەوانە:

---

١ الصحاح تاج اللغة و صحاح العربية - الفارابي - ج٤ – ١٦٧٧. كتاب الحديث - الفراهيدي البصري - ج٨ - ٤٢٥.

١. زیادەڕەوەی کردن لە داواکردنی مارەیی: مارەیی لە شەرعدا سنوری نییە زۆر بێت یان کەم، بەڵام تا کەمتر بێت بەرەکەتی زۆرترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أعظم النساء بركة أيسرهن مؤنة)[١].

**هۆکارەکانی زیادبوونی مارەیی:**

أ- شانازیکردن بە مارەیی زۆر لە ناو خزمان و هاوڕێیان و کۆمەڵگادا.

ب- لاوازی دینداری.

ت- ڕوانین بۆ مارەیی وەك کڕین و فرۆشتن نەك هاوسەرگیری.

ث- پرس نەکردن بە کچ.

ج- نەبوونی یاسایەك کە ڕێگری بکات لە مارەیی زۆر.

ح- نەریت و کلتوری باری ناو خێزان یان عەشیرەت یان کۆمەڵگا.

**زیانەکانی زیادکردنی مارەیی:**

أ- تێنەگەشتن لە دین، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا هەبووە ئافرەتی لەسەر فێرکردنی قورئان مارەکردووە لەکاتێکدا کەسەکە هیچی تری نەبووە: (زوج امرأة رجلا بما معه من القرآن) [٢]، هەروەها أم سليم کاتێك شوی بە أبو طلحة کرد مارەییەکەی تەنها مسوڵمان بوونی مێردەکەی بوو.

ب-پشتگوێ خستنی گەنجان لە زەواج.

---

١- مسند الإمام أحمد: ٢٤٧٢٤، سنن النسائي الكبرى: ٩١٨١.

٢- البخاري و مسلم.

ت- زۆری مارەیی لە جیاتی بەختەوەری بێ متمانەیی لە نێوان ماڵی کچ و کوڕەکە و ژن و مێردا دروست دەکات.

ث- کەس و کار پێیان وایە مافی کچەکەیان دەستەبەر دەکەن کە لە ڕاستیدا وا نییە.

ج- دروستکردن و داهێنانی نەریتی خراپ لە ناو کۆمەڵگەدا کە دواتر دەبێتە نەریتێکی ناقۆڵا و گران و زەحمەت.

ح- ناشیرنکردنی ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی کە خەڵك وا دەزانێت ئەمە کاری ئیسلامە.

بۆیە پێویستە مارەییەك دا نەنرێت کە نەتوانرێ بدرێت و وەفای پێوەبکرێت.

٢. زاڵبوونی نەریتی خراپی کۆمەڵگا لە درەنگ زەواجکردن بە بیانوی جۆرا و جۆر و ناڕەوا.

٣. بە ماددی بوونی کۆمەڵگا ڕێگری دەخاتە بەردەم پڕۆسەی زەواج.

٤. داواکردنی کەل و پەل و خشڵی زیاد، وەك ئاهەنگ و دەعوەت و سالۆن و چەندین مەسرەفی تر بێجگە لە مارەیی.

٥. کچ نەدرێت بە هاوکوف و هاوشانی خۆی، ئەمە دەبێتە هۆی ناپاکی هاوسەری (الخیانة الزوجیة).

٦. بیانوگرتن بە درێژەدان بە پڕۆسەی خوێندن لە کاتێکدا ئەگەر کوڕ و کچەکە باری یەکتر گران نەکەن و کەس و کاریان هاوکار بن و بابەتی منداڵ دوابخەن، دەتوانن بەردەوامی بە پڕۆسەی خوێندنیش بدەن.

٧. بێکاری و هەژاری لەمپەرێکی گەورەیە لەبەردەم پڕۆسەی زەواج.

٨. بوونی بە دیل و جێگرەوەی ناشەرعی لە ئیباحیەت و هۆکارەکانی خۆ خاڵیکردنەوە خۆساردکردنەوە.
٩. ڕەواجدان بە بازاڕی لەشفرۆشی و مەساج و هەموو ئەو شوێنانەی کە دەتوانرێت بکرێتە بەدیل و جێگرەوەی هاوسەرگیری.
١٠. خەیاڵی بوون و خەیاڵی بیرکردنەوە لە پرۆسەی زەواجدا، دەبینی کوڕێك کچێکی خەیاڵی دەخاتە ناو مێشکی خۆیەوە کە دەبێت خاوەنی ئەو مواسەفاتانە بێت ئەگەر نا هاوسەرگیری ناکەم، کچیش بە هەمان شێوە.
١١. جاری وا هەیە کەس و کار ڕێگرن لەوەی کچ بە دڵی خۆی شوو بکات، باوك دەڵێت: بۆ ئامۆزای یان خزمێکی ترم داناوە، یان دایك دەڵێت: دەبێت شوو بە برازاکەم یان خوشکەزاکەم بکات، لە کاتێکدا کچ بەم زەواجە ڕازی نییە و دڵی لە شوێنێکی ترە.
١٢. یان بە بە پێچەوانەوە کچەکە یان کوڕەکە دڵی بە خزمێکی خۆیەوەیە بەڵام دایك یان باوك دەڵێت: نایدەم بە خزمان، بەمەش گرفت دروست دەبێت.
١٣. جاری وا هەیە کوڕەکە بە قۆناغێکی سەختدا تێپەڕیوە و بێز لە هاوسەرگیری دەکات بۆ کچەکەش هەمان شت ڕاستە.
١٤. ڕازی نەبوون بە فرە ژنی جا یان لەلایەن خودی کچەکەوە بێت یان کەس و کار یان کۆمەڵگە یان بە یاسا قەدەغە بکرێت یان مەرجی دەستەوەستانکەری بۆ دابنرێت (الشروط التعجيزية).

١٥. لا نەکردنەوە و ئاوڕنەدانەوەی دەوڵەمەندەکان بە لای ئەو پڕۆسە گرینگەدا، کە پێیان وایە خێر تەنها مەڕ و بزنە یان دروستکردنی مزگەوتە یان پڕۆژەیەکی خێرییە، لەکاتێکدا پڕۆسەی هاوسەرگیری کە لەوانە گرینگتر نەبێت کەمتر نییە، وە دەتوانرێت چەندین دەوڵەمەند بەیەکەوە ئاهەنگی بە کۆمەڵ ساز بکەن بەوەش سامانێکی زۆر بۆ هەمووان دەگەڕێتەوە.

١٦. خراپ و ناشیرین وێناکردنی هاوسەرگیری لە فیلم و دراماکان، کە وای نیشاندەدات کە زەواج دەرد و مەینەتە و پڕە لە فرمێسك و خیانەت و هەژاری و جیابوونەوە ...هتد.

١٧. یەکێك لە لەمپەرەکانی بەردەم زەواج کۆچی گەنجانە بۆ دەرەوەی وڵات، کە ئەو گەنجانە دوای ئەوەی دەبنە خاوەن ئیقامە لە ئەوروپا هەر زەواج ناکەن، یان لە وڵاتی خۆیان دەیکەن ئەوەش گران لەسەریان دەوەستێت.

١٨. بیانو گرتن بە سەفەرکردن و ئیشکردن لە دەرەوەی وڵات.

١٩. ڕیزبەندی لە ژنهێنان و شوکردن، زۆرجار بووە کچی ناوەنجی یان بچوك داخوازی هاتووە بەڵام بە بیانوی ئەوەی گەورەکە شووی نەکردووە ڕێگایان نەداوە زەواجەکە بکرێ، ئەو دیاردەیە بۆ کوڕیش هەر ڕاستە.

٢٠. متمانە بەخۆ نەبوون و بڕیارنەدان، چەندین جار دەرفەتی باش بۆ هەردوو ڕەگەز دەڕەخسێ، بەڵام بڕیاریان پێنادرێ و توشی کێشەی دەرونی بوون.

٢١. ترسان لەوەی کە فەشەل بێنێ لە زەواج نازانێت، ئێستا بۆ خۆی لە حاڵەتێکی خراپی خۆدۆڕاندا دەژیت.

٢٢. کار پەیداکردن یان بوون بە خاوەنی موچە بە مەرج دانان، کە ئەمە نابێت گرینگی پێنەدرێت بەڵام نابێت لە قەبارەی خۆی گەورەتر بکرێت.

٢٣. ژیان لە ڕابردوو، کەسێك کەسێکی خۆشویستووە لە ڕابردوودا بەڵام بۆی نەبووە یان فەشەلیان هێناوە یان نەماوە یان دوورکەوتۆتەوە و دەستی پێناگات ئەمە وا دەکات کە نەتوانێت هاوسەرگیری بکات.

٢٤. ترسان لە نەمانی ئازادی، زۆر کەس هەیە پێی وایە ئەگەر شوو بکات ئازادی لەدەست دەدات لە کارکردن و سەفەر و ئاواتەکانی.

٢٥. بیانوگرتن بە منداڵ، زۆر کەس هەیە لە مێردەکەی جیابۆتەوە یان هاوسەری مردووە و منداڵی هەیە بە بیانوی منداڵەکانی شوو ناکاتەوە.

٢٦. ناوزڕان، کەسی وا هەیە ناوی زڕاوە لە کۆمەڵگا بۆیە ناتوانێت هاوسەرگیری بکات.

## هۆکاری شەشەم: بیانوی تەواونەکردنی خوێندن (الدراسة)

یەکێك لە هۆکارەکانی زیادبوونی تاوانی زینا بیانوگرتنە بە تەواو نەکردنی خوێندن و دیراسە.

ئەم بیانووە بۆ هەندێك کەس لەوانەیە ڕاست بێت بەڵام بۆ زۆرێکیش لە قوتابیان دەبێتە گرفت، چونکە چ ڕێکایەك و جێگرەوەیەك هەیە بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووی سێکسی بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە ناتوانن بەسەرخۆیاندا زاڵبن، هەر بۆیە لە زەواجی شەرعی و ڕاستەقینە ڕایانکردووە بۆ زەواجی عورفی و مەدەنی ...هتد، بێجگە لەوەش کە بەدزی و بە ئاشکرا زینا ئەنجامدەرێت.

بێگومان لە حەقی ئەو کەسەی کە بەسەر خۆیدا زاڵ نابێت واجبە لەسەری بیر لەوە بکاتەوە بە شێوەی شەرعی ئارەزوەکانی دابمرکێنێت، وە دەشکرێت ئاسانکاری لە زەواج بکرێ بە جۆرێك حکومەت و کۆمەڵگا دەسیان بگرن و ئاستەنگ دروست نەکەن لە زەواجی شەرعی با لە کاتی خوێندنیشدا بێت.

ئەوەی گرینگە بگوترێت و بزانرێت خوێندن بۆ کەسانی ناحاڵی و ئارەزووپەرست بووەتە جێگای دڵداری و حەزحەزێنە و پەیوەندی ناشەرعی و زۆر جاریش خستنەوەی منداڵی نا شەرعی.

## هۆكاری حەوتەم: سفوری و خۆڕوتكردنەوە

گومان لەوەدا نییە كە ئافرەت بەو جوانی و سەرنجڕاكێشیەی كە هەیەتی توانای خستنە داوی پیاوانی بەهێزە، یان دەتوانرێت وەك ئامرازێك و تەڵەیەك بەكاربهێنرێت بۆ بڵاوكردنەوەی خراپەكاری و فەساد لە كۆمەڵگادا.

خۆڕوتكردنەوەی ئافرەتان بێجگە لە ناشەرعی بوونی زیانی گەورەش بە تەندروستی ئافرەتان دەگەیەنێت.

### هۆكارەكانی سفوری و ڕوتی

١. نەزانی و نەشارەزایی بە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام، پەروەردگار فەرمانی كردووە بە ئافرەتان تا بكرێ لە ماڵەوە ئۆقرە بگرن و خۆیان دەرنەخەن وەك خۆدەرخستنی سەردەمانی نەفامی: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢﴾ [الأحزاب: ٣٢].

وە پێیان دەفەرموێت لە قسەكردنیشدا وریا بن و بە شێوەیەك قسە مەكەن دەنگی خۆتان ناسك و نازاوی مەكەن چونكە پیاوانی دڵ نەخۆش ئومێد و هیوای خراپ پەیدادەكەن.

وە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردووە كە بە خێزانەكانی و كچەكانی و ئافرەتانی ئیماندااران بڵێت كە عەبا بەكاربهێنن بۆئەوەی بناسرێن

کە ئەوانە خراپەکار نین و ئازارنەدرێن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا٥٩﴾ [الأحزاب: ٥٩].

پەروەردگار فەرمانی بە پیاوان و ئافرەتان کردووە کە لە چاویان بگرنەوە: ﴿وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ٣١﴾ [النور: ٣١].

وە چەندین ڕێنمایی گرینگ هەتاکو ئەوەی پەروەردگار سزای سەختی دونیا و قیامەتی بڕیارداوە بۆ ئەو کەسەی حەزی لە فاحیشەیە و حەزدەکات لەناو مسوڵمانادا بڵاوببێتەوە، ئەدی ئەو کەسەی کە خراپەکە دەکات و بانگەشەی بۆ دەکات و پلانی بۆ دادەنێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ١٩﴾ [النور: ١٩].

وه فەرمویەتی كه جوانیەكانیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی كه ناشاردرێتەوه (دەست و دەم و چاو): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢١﴾ [النور: ٢١].

وه با پێیەكانیان لە زەوی نەدەن بۆئەوەی خرخاڵەكانیان دەركەوێت و دەنگی بێت: ﴿وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ [النور: ٣١].

٢. لاوازی ئیمان: مەرج نییە مرۆڤ هەر نەزان بێت بۆئەوەی تاوان بكات، جاری وایە لە لاوازی ئیمانەوەیە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لا يزني

الزاني حين يزني و هو مؤمن)[١]، کەواتە مرۆڤی ئیماندار لەو کاتەدا ئیمانی تەواو بێت زینا ناکات یان دزی یان تاڵانی یان پیاوکوژی ...هتد، لاوازی ئیمان هۆکاری زۆرە و دەکرێ چارەسەر بکرێت کە لەم بارەوە نوسراوی زۆر هەیە.

٣. گومان لەوەدا نییە کە دوژمنان هەوڵیانداوە کە ئافرەت وەك چەکێکی کاریگەر بەکاربهێنن لە دژی دین و مسوڵمانان کە خۆ ڕوتکردنەوەی ئافرەتان بەناوی باق و بریقەوە هەنگاوی سەرەتایی ناحەزان بوو، وە تێشیدا سەرکەوتوو بوون و لەم بوارەشدا نوسراوی زۆر باش هەیە.

٤. عەمیل و بەکرێگیراوانی دوژمنان: بێگومان ڕۆڵی عەمیل و بەکرێگیراوان و دۆڕاوەکان زۆر کاریگەرتر بوو لە ڕۆڵی دوژمنان، کە لە ئیسلامدا بە مونافیق مورجیف و دوژمن ناوزەند کراون. کورد دەڵێت: دار هۆرەی لەخۆ نەبێت نا قەڵشێت، بێگومان کاتێك ئەو پەندە گوتراوە هەر دار بەکارهێندراوە و کراوە بە هۆرە بۆیە وا گوتراوە. بە ڕوونی دیارە لە مێژووی کۆن و نوێدا ئەو راستیە سەلمێندراوە، کە دوژمنی ناوخۆ کاریگەرتر بووە لە دوژمنی دەرەکی.

٥. شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەی کوێرانە: بێگومان خۆڕوتکردنەوەی زۆربەی ئافرەتان بۆ دژایەتی دین نییە، بەڵکو لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ئەو کەسانەیە کە خۆیان ڕوتدەکەنەوە، بۆیە دەبێت وریا بین

---

١- البخاري: ٢٤٧٥.

مەرج نییە ئەوەی خۆی ڕوتدەکاتەوە دژی دین بێت یان لەبەر بێدینی بێت، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری نەزانی و لاسایی کردنەوەیە.

٦. میدیا بە هەموو شێوەکانییەوە.

٧. ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان.

٨. کەمبوونەوەی غیرەی پەسەند لە باوکان و بەرپرسانی خێزان.

٩. کەمبوونەوە و نەمانی پێشەنگی باش.

١٠. سەفەرکردن بۆ دەرەوە و سەرسام بوون بە هەموو شتێکی ئەوان، کە پێیان وایە هەرچی ئەوان بیکەن ڕاستە لە کاتێکدا زانا و بیرمەندەکانیان لەمێژە هاواریان لێبەرزبووەتەوە.

١١. دەستخستنیماڵێکی زۆر بە دەست ئافرەتان کە تێیدا توشی کڕینی ئەو جلە بێشەرعیانە دەبێت و هەر ڕۆژە و بەشێوەیەك خۆی ڕادەنوێنێ، کە بێگومان ئەمەش ماڵێکی زۆری گەرەکە.

١٢. سستبوونەوەی دەعوە و بانگخوازی لە لایەن بانگخوازانەوە بەتایبەت لە ناو ئافرەتان.

١٣. خوێندنگاکان بە هەموو ئاستەکان دیاردەی سفوری تێدا بەربڵاوە، ئەوەش وایکردووە کە ئافرەت بەلایەوە زۆر ئاسایی بێت بە هەر جۆرێك خۆی ڕوتدەکاتەوە تاکو دەبێتە جۆرێك لە پێشبڕکێ هەر ڕۆژە و یەکێك یان چەند کەسێك بە جلێکی سفورتر و مۆدەتر دێنە خوێندنگا.

١٤. بەشێك لە رێكخراوەكانی ئافرەتان: بێگومان بەشێك لە رێكخراوەكانی ئافرەتان بە ئامانجی ئەوە دامەزراون یاخود كاری سەرەكییان ئەوەیە كە برەو بە سفوری بدەن و جوانی بكەن و بانگەشەی بۆ بكەن.

١٥. لە هەمووی گرینگتر جێبەجێ نەكردنی شەریعەتە، كە ئەمەش هۆكاری زۆرە و ئەم كتێبە بۆ ئەم بابەتە تەرخان نەكراوە.

عەڕەب دەڵێت: (الأشياء تعرف بأضدادها). واتا: شتەكان بە دژەكانیان دەناسرێن و دەناسرێنەوە، دەتوانین لە هۆكارەكان چارەسەرەكان وەربگرین.

## هۆكاری هەشتەم: هاوڕێی خراپ

هیچ گومان لەوەدا نییە كە هاوڕێی خراپ زۆرترین كاریگەری لەسەر هاوڕێ هەیە.

عن المرء لا تسأل و سل عن قرينه

فكل قرين بالمقارن يُقتدى

واتا: پرسیار لە كە سێك مەكە پرسیار بكە لە هاوڕێ و ڕەفیقەكەی، چونكە هاوڕێ بە هاوڕێ كاریگەرە و لاسایی دەكاتەوە.

دوو هاوڕێ كە بە یەكەوە بوون بێگومان یەكیان كاریگەری لەسەر ئەویتر دروست دەكات، لەو كاتەدا كامەیان بەهێزتر بێت ئەویان كاریگەری بۆ سەر ئەوەی تر دەبێت.

## هۆکاری نۆیەم: گۆرانی و مۆسیقای بێکەڵك و خراپ

دیارە لەسەر دروستی و شەرعییەتی گۆرانی و مۆسیقا ڕاجیایی لە نێوان مسوڵماناندا هەیە.

بەڵام من گەیشتوومەتە ئەو ڕایەی کە ئەگەر گۆرانی و مۆسیقا هاوکات نەبێت لەگەڵ شتی خراپ و بێشەرعی ناشەرعی نییە، بەڵام لە ئێستادا زۆربەی لە خراپەدا بەکاردێت بەتایبەتی گەنجان گەیشتوون بە ئەندازەی مەستبوون (الإدمان). گەنج وای لێهاتووە لە کاتی خەوتن و ناو سەیارە و ڕێگا و هەتا لە ناو دیراسە و خوێندندا ئاڵودە (مدمن)ی گۆرانی و مۆسیقا بووە.

## هۆكاری دەیەم: جادوكردن

لەوانەیە زۆر كەس بڕوای بە كاریگەری جادوو نەبێت هەتا لە ناو مسوڵمانانیش هەن، وەك: (موعتەزیلەكان) لە كۆندا و زۆر كەسی تریش لە ئێستادا هەمان ڕایان هەیە، لەوانەیە زیادەڕەوی هەبێت لە بڕواكردن بە جادوو كردن، بەڵام كاریگەرییەكەشی زۆر ڕونە بە واقیعی دەبینرێت بەتایبەتی جادووگەرەكان هەڵدەستن بە دروستكردنی پەیوەندی ناشەرعی، یان لێكجیاكردنەوەی ژن و مێرد وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ١٠٢﴾ [البقرة: ١٠٢].

كەواتە لە كارە قێزەونەكانی جادووگەرەكان كوفركردن و تێكەڵكردنی ڕاستی ناڕاستی و لێكجیاكردنەوەی هاوسەرانە، بۆیە ئەركی حكومەتە ئەم قۆڵبڕ و گێرەشێوێنانە لە كۆمەڵگا تەمبێ بكات و سزایان بۆ دابنێت، وە ئەركی

مامۆستایانی ئایینی و ڕۆشنبیرانە کە ئەم فاسید و خراپەکارانە لە کۆمەڵگا بناسێنن و خەڵکیان لێ وریا بکەنەوە.

## هۆکاری یازدەیەم: نەرمی و ناسکی نواندن لە قسەکردندا

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا٣٢﴾ [الأحزاب: ٣٢].

چونکە ئەگەر ئافرەت بە نەرم و نازەوە قسەی کرد، واتا: قسەکردنەکەی ئاسایی نەبێت، جا بە پێکەنینەوە بێت یان بە چاو تێبڕینەوە، بە لەنجە و لارەوە بێت، بێگومان ئەو کات کەسی بەرامبەر بەتایبەت ئەگەر دڵ نەخۆش بێت، هیوا پەیدا دەکات و ئەمە دەقۆزێتەوە، کەواتە شێوازی قسەکردن زۆر کاریگەری هەیە ئەمەش ئەوەندە ڕوونە بەڵگەی واقیعی ناوێ ئایەتە پیرۆزەکە بڕیویەتەوە.

## هۆکاری دوازدەهەم: ڕێگری ئافرەتان لە سەرجێی کردنی پیاوەکان و بە پێچەوانەوە

بێگومان یەکێك لە ئامانجەکانی هاوسەرگیری کپکردنەوەی ئارەزووی سێکسییە بەڕێگای خۆی کە هاوسەرگیرییە، بۆ ئەو کەسەی کە هاوسەری هەبێت، ئەمەش تەنها بۆ ئافرەت نییە کە ڕێگری لە هاوسەرەکەی بکات بۆ سەرجێی بۆ پیاویش پێویستە کە پێویستیە جنسیەکانی ئافرەت جێبەجێ بکات، بە بەڵگەی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًاۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾﴾ [البقرة: ٢٢٨]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْۖ فَٱلْـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِۚ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ [البقرة: ١٨٧].

ئەم دوو ئایەتە هەموو ئەو بۆچونە چەوتانە ڕاستدەکەنەوە کەوا نیشاندەدرێت کە تەنها پیاو خاوەنی مافی تەواوە، کە ئەمە وا نییە ئافرەت چی لەسەر بێت لە ئەرك لە بەرامبەریشدا بە پێی سروشت و پێویستی خۆی ئەوەی بۆ هەیە لە ماف، بێگومان پشتگوێخستنی ئافرەت لە ڕووی جنسیەوە یان هی ئافرەت بۆ مێردەکەی دەبێتە هۆیەکی سەرەکی بۆ ڕوودانی خیانەتی هاوسەری کە لە ناو کۆمەڵگادا تەواو پەرەی سەندووە بەتایبەت لە ڕۆژئاوا.

## هۆکاری سێزدەهەم: بەجێهێشتنی ئافرەت بۆ ماوەیەکی درێژ یان زیندانی کران

کەسێك کە خێزانەکەی جێدەهێڵێت بە بیانوی بازرگانی و خوێندن و سەفرە و سیاحەت ئایا دڵنیان لەوەی کە هاوسەرەکانیان توشی خراپە نابن یان بۆخۆیان توش نابن، بەتایبەت لە کوردستانی باشور گەنجان بە سەدان هەزار ڕوویان کردە هەندەران کە ئەوەش هۆکاری خۆی هەیە، بەڵام بەشێك لەوانە خاوەنی خێزانن، جاری وایە بە چەندین ساڵ ئیقامەیان پێ وەرناگیرێت، یان خێزان لە کوردستان مارە دەکەن بەچەندین هەوڵ و کۆشش بۆیان دەرناچێت، ئەگەر هەر وا بمێننەوە خراپە، چارەسەری تریشیان لا نییە، زۆریش هەبووە ناچاربووە دەستبەرداری خێزانەکەی بێت لەدوای چەندین هەوڵ و کۆشش لە هەموو حاڵەتەکاندا پیاوەکە و ئافرەتەکە ناتوانن پێویستی جنسی یەکتر پڕبکەنەوە، ئایا هەموو کەس دەتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵبێت و زینا نەکات.

بابەتی زیندانی کارەساتێکی زۆر گەورەیە لە هەموو ڕوێکەوە، بەڵام بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە چەندین ساڵ لە زینداندا دەمێننەوە یان حوکمی هەتاهەتاییان بەسەردا سەپێنراوە، ئایا ئەم دوو کەسە چۆن دەتوانن مافی جنسی یەکتر بدەن؟

بەداخەوە زیندان بووەتە بنچینەی سزادانی تاوانبار، چونکە یاسای سزادان لەدوای لە سێدارەدان (الإعدام) و غەرامەکردن بنچینەکانی تری

هەموو بەندکردن و زیندانیکردنە، کەسێکیش کە غەڕامە نادات یان نیەتی بیدات دەبێت زیندانی بکرێت کەواتە هەموو شتێك بوو بەزیندانی کردن.

یان ئەو کەسەی کە شوێنبزر دەبێت بۆ چەندین ساڵ، ئایا ئەو خێزانە لەکوێ و چۆن ئارەزوە جنسییەکانی خۆی تێربکات؟ بێگومان لە ڕوانگەی شەرعەوە یاسای بۆ دانراوە دەبێت یاساش بیری لەوە کردبێتەوە بەتایبەت لە کاتی جەنگەکان ئەمە زۆر ڕوودەدات.

## هۆكاری چواردەهەم: مادده سڕكەر و هۆشبەرەكان

مادده سڕكەر و هۆشبەرەكان لەمڕۆدا زیادی كردووە و بە یاساش بە تاوان دادەنرێت و سزای توندی بۆ دانراوە، بەڵام بە كۆی گشتی ئەم تاوانە و قوربانییەكانی ڕۆژانە لە زیادبووندان.

**لە دیارترین هۆكارەكانی توشبوون بەو ماددانە ئەمانەن:**

١. لاوازی دینداری چونكە دین بەهێزترین پاڵنەرە بۆ توشنەبوون یان وازهێنان لە مادده هۆشبەرەكان.
٢. هاوڕێی خراپ.
٣. گەنجان پێیان وایە لایەنی جنسیان بەهێز دەكات، ئەمە بۆماوەیەكی كورت بۆ هەندێك مادده ڕاستە، بەڵام دواتر كەسەكە وێران دەبێت.
٤. چونەدەرەوە بۆ وڵاتان بەتایبەت ئەو وڵاتانەی كە زیاتر ئەو ماددانە بەكاردەهێنن وەك وڵاتی ئێران.
٥. هەستكردن بە بەتاڵی و بێكاری.
٦. لاساییكردنەوەی كوێرانە.
٧. شەونخونی لە دەرەوەی ماڵ.
٨. لە دەستدا بوونی ماڵێكی زۆر بێ ماندوو بوون.
٩. گرفتی ماڵەوە و كێشەی خێزانی.
١٠. نزمی ئاستی خوێندەواری و ڕۆشنبیری.

١١. پێشەنگی خراپ لە ماڵ، وەك: باب و داك یان یەكێكیان یان برا و خوشكی گەورە.
١٢. ناهاوسەنگی لە نێوان ژن و مێرد بەتایبەت لەڕووی تەمەن، زیاتریش پیاوان توشی ئەو حاڵەتە دەبن.
١٣. بێئاگابوونی باوك و دایك لە منداڵەكان و وێڵكردنیان و پەروەردە نەكردنیان.
١٤. توند و تیژی زیاد لەپێویست لەگەڵ منداڵەكان، بەتایبەت كوڕان.
١٥. بەكارهێنانی زۆری باوك و دایك بۆ دەرمان و دەرزی هۆشبەر و سڕكەر.
١٦. فشارخستنە سەر منداڵ زیاد لە ئەندازەی خۆی بۆئەوەی سەركەوتوو بێت لە خوێندن لە كاتێكدا ناتوانێت بگات بەو ئاستە[1].

بێگومان شوێنەواری زۆر خراپ بەجێدەهێڵێت لە هەموو لایەنەكانی ژیانی مرۆڤ، كە من لێرە باسی شوێنەوارەكانی ناكەم، چونكە چەندین لێكۆڵینەوەی ورد و درێژی لەسەر كراوە.

بەڵام هەموو توێژینەوە و دراسەكان پێماندەڵێن: بە ڕێژەیەكی یەكجار زۆر مادده هۆشبەرەكان پەیوەندیان بە لایەنی جنسییەوە هەیە[2].

---

١- اتجاهات الشباب البطال نحو تعاطي المخدرات - رسالة ماستەر: ثويبات قدور، ل ٨١.

٢- أبعاد الاغتراب النفسي و علاقتها بتعاطي المخدرات لدى المراهق: سعيدي عتيقة، ل ١٥٩.

## هۆکاری پازدەهەم: نەبوونی دادوەری لە نێوان خێزانەکان

گومان لەوەدا نییە دادوەری بنچینەیە لە نێوان حاڵەتی فرەژنیدا، وە مەگەر لە کاتی ناچاریدا پەنا بۆ صولح ببردێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟ ۝٣﴾ [النساء: ٣]. وە پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ دەفەرموێت: (من كان له امرأتان يميل إلى إحداهما على الأخرى جاء يوم القيامة إحدى شقيه مائل)[1].

وە بنچینەی دادگەری نەفەق و جێگای نیشتەجێبوون و مانەوەی شەوانە.

مانای وا نییە شتی تر پێویست ناکات، بەڵام ئەوانە شتە بنچینەییەکانن، بەڵام لە ناچاریدا پەنا بۆ صولح و سازان دەبردرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ۝١٢٩ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ۝١٣٠﴾ [النساء: ١٢٩-١٣٠].

---

١- رواه أبو داود: ٢١٣٣، الترمذي: ١١٤١، ابن ماجه: ١٩٦٩، سنن الدارمي: ٢٩٥٥، مسند الإمام أحمد: ٧٩٣٦ – ٨٧٦٨ – ١٠٠٩٠.

كەواتە كە پەنا بۆ صولح و سازان دەبەیت لەبەر بنچینەی بەراوردكارییە، كە ئەم حاڵەتە یان ئەم كەمە زوڵم و ستەمە باشترە لە ستەمی گەورەتر، بەڵام ئەگەر هاتوو بەبێ هیچ هۆیەك پیاو دادگەری نەكات ئەوا لەوانەیە ئافرەتەكەش بیر لە تۆڵەسەندن بكاتەوە بەتایبەت لەو كاتەدا ئافرەتەكە لە پیاوەكە بێ هیوا بێت و سەرجێی نەكات یان زۆر بەكەمی بچێتە لای.

جاری واش بووە ئافرەت وەك تۆڵە سەندنەوە ئەم كارەی كردووە كە مێردەكەی خیانەتی لێكردووە یان زۆر فەڕق و جیاوازی پێكردووە پەنای بۆ ئەو كارە قێزەونە بردووە.

## هۆكاری شازدەهەم: ڕێگری كەس و كار لە بەشوودانی كچ

مافی هەر كوڕ و كچێكە كە گەیشتنە تەمەنی گونجاو هاوسەرگیری بكەن، پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾﴾ [النور: ٣٢].

(الأيامى) كۆی (أيِّم)ە، هەر پیاوێك خێزانی نەبێت بە هۆی تەڵاقەوە بێت یان مردن یان هەر نەیهێنابێت ئافرەتیش بە هەمان شێوە، ئەم ئایەتە بە پلەی یەكەم ئەوانە دەگرێتەوە كە توانادار و دەسەڵاتدارن و دەتوانن كارئاسانی بۆ ئەوە بكەن بەتایبەت حكومەت ئەركییەتی كە پێشینەی هاوسەرگیری و خانو دابین بكات بۆ ماوەی درێژخایەن بۆ ئەوەی گەنجان بتوانن هاوسەرگیری بكەن، كەس و كار جا كەس و كاری كچ بن یان كوڕ دەبێت ئاسانكاری بكەن بۆ هاوسەرگیری منداڵەكانیان، بەتایبەتیتر كەس و كاری كچ نابێت لەمپەر دابنێن لەبەردەم كچەكانیان لە كاتێكدا كەسێكی گونجاو لە دەرگای داون و داخوازی كچ یان خوشكیانی كردووە، هەر كەمتەرخەمیەك لەو بارە بە گوناھ حیساب دەكرێت بەتایبەتی ئەگەر تاوانی لێكەوتەوە.

## هۆکاری حەڤدەهەم: نەبوونی هاوسەنگی لە تەمەن

هاوتەمەنی و لێکنزیك بوون لە تەمەن کاریگەری زۆری هەیە بۆ دوور بوون لە تاوانی زینا. کاتێك پیاوێك ئافرەتێکی زۆر منداڵ دەهێنێت، ئەو زوو بەتەمەندا دەچێت ئەویش تازە پێدەگات، ئەگەر ژنەکە لە خوا نەترسێت و بە وەفا نەبێت توشی تاوانی زینا دەبێت.

یان ئەگەر ژنەکە بە ئەندازەیەکی زۆر لە پیاوەکە گەورەتر بێت هەمان کارەساتی لێدەکەوێتەوە، یان هاوشانی یەکتر نەبن لە ڕووی جوانی و ڕووەکانی ترەوە.

## هۆکاری هەژدەهەم: داواکاری و تەکالیفی زۆری کەس و کاری کچ لە زاوا

گومان لەوەدا نیە کە زەواج ئامانجدارە لە شەریعەتدا، لە ئامانجە هەرە دیارەکانی زەواج خۆشبەختی و ئاسودەییە، بەشێک لە بەختەوەری و کامەرانی بواری مادديیە، جا ئەگەر ئەرکی کوڕ ئەوەندە گران بکرێ لە ڕوی مادديیەوە گومان لەوەدا نیە کە بەختەوەر و دڵخۆش نابێ بەو هاوسەرگیرییە، واتە سەرەتای هاوسەرگیری بە خەم و ناسور و بیرکردنەوە لە قەرز دەست پێ دەکا، بۆیە پێویستە دایکان و باوکان بیر لەوە بکەنەوە چۆن ئەو کوڕ و کچە بەختەوەر دەبن، لانی کەم کە هاوکاریشیان نابن با ژیانی خۆیان بۆ خۆیان لێ گەڕێن، ئەوان چۆن ڕازین و ئارامن با ئاوا بکەن، نەوەک هەر دایک و باوک بەڵکو دەبێ هەموو ئەو کەسانەی دەوریان هەیە و کاریگەرن هاوکاربن بۆ سەرگرتنی پڕۆسەی هاوسەرگیری، لە حکومەت و ڕێکخراوەکان و وەزارەتە پەیوەندی دارەکان و رۆشنبیران و دەوڵەمەندان و میدیا و هەموو قسە ڕۆیشتوان بە تایبەتیش مامۆستایانی ئایینی و ئافرەتان خۆشیان.

## هۆکاری نۆزدەهەم: باش یەکتر نەبینینی کچ و کوڕ لە کاتی داخوازیدا

من بۆخۆم ئەو حاڵەتەم بینیوە کە گوتویانە: کچەکەم باش نەبینیوە یان کچەکە دەڵێت کوڕەکەم باش نەبینیوە دواتر هاوسەرگیرییەکە بە کۆتا هاتووە، بۆیە پێغەمبەری نازدار ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات بۆ یەکتر بینین بە ئەندازەی پێویست.

هەرچەندە ئەم بابەتە لەمڕۆدا بە پێچەوانەی ڕابردوو زیادەڕۆیی تێدادەکرێت، بەڵام بە هەر حاڵ یەکتر بینین پێویستە، وەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «فَاذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الْأَنْصَارِ شَيْئًا»[1].

---

١- صحيح مسلم: ١٤٢٤، سنن النسائي: ٣٢٣٤ – ٣٢٣٦ – ٣٢٤٧، مسند أحمد: ٧٨٤٢ – ٧٩٧٩.

## هۆكاری بیستەم: پشتگوێخستنی منداڵ له بواری پەروەردە و بەرگ و پۆشاك بە منداڵی

منداڵ دەتوانرێت بە بچوكی ڕابهێنرێت لەگەڵ شتە جوانەكان بە بێ ئەوەی لەسەری گران بكرێت، بەتایبەتی بەرگ و پۆشاك، ئەمەش شێوازی خۆی هەیە لە خۆشەویستكردن و جوانكردن و هاندان بۆ پۆشاكێكی جوان.

منداڵ پێویستی بە پەروەردەی هەمە لایەن هەیە وەك:

- ✓ ئیمانی.
- ✓ عەقڵی.
- ✓ دەرونی.
- ✓ كۆمەڵایەتی.
- ✓ جنسی (سێكسی).
- ✓ تەندروستی.
- ✓ ئەخلاقی.
- ✓ وەرزشی.
- ✓ زانستی.

وە زۆر لایەنی تریش هەن منداڵ نابێت فەرامۆش بكرێت بەتایبەت ئامۆژگاری كردنی منداڵ و پەروەردەكردنی بە زۆر لایەنی جوان، وەك ئامۆژگاری كردن بە:

- ڕەوشتی جوانی باوك و دایك و گەورەكان ئەمە گەورەترین و كاریگەرترین ئامۆژگاریە.
- قسە و چیرۆك و وتەی جوان.
- خوێندنەوەی ژیانی مندالّە سەركەوتووەكان.
- ڕێگای پەیداكردنی هاوڕێی باش.
- هاندان بۆ شتی جوان.
- فیلم و نامیلكە و كتێبی پەروەردەیی و سەرنجڕاكێش.
- بە سەرزەنشتكردن و تەمبێ كردن و توڕەبوون كە پێویست بوو.

مەبەستمان ئەوەیە مندالّ لە هەموو ئەو بوارانە هانبدرێت بۆ لەبەركردنی پۆشاكی جوان و شەرعی بەڵام بە بێ فشار، دەبێت بە قەناعەت بێت و لای خۆش و خۆشەویست بكرێ و سوود و قازانجەكانی بۆ ڕونبكرێتەوە، وە هەروەها زیان و زەرەرەكانیشی بۆ لەبەر چاو دابنرێت بەو زمانە كە تێی دەگات.

## هۆکاری بیست و یەکەم: ژینگەی خراپ

بێگومان مرۆڤ کاریگەرە بە دەوروبەر و ژینگەی خۆی ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، بۆیە دەوروبەر گرینکە بۆ کاریگەری چاك و خراپ.

کەسێك لە کۆمەڵگەیەکدا بژی کە زینا بە لایەوە ئاسایی بێت، خیانەتی هاوسەری کاری ڕۆژانە بێت، هاوڕێکانی لە خراپە نەگەڕێنەوە و بە ئاسایی وەریبگرن بێگومان مرۆڤ توش دەبێت، بۆیە زۆر گرینگە شوێنی کار، خێزان، هاوڕێ، ژینگە بە گشتی هاوکار بێت بۆ کەمکردنەوەی تاوانی زینا. خۆ ئەگەر ئەوانە هاوکار نەبوون بە پێچەوانەوە هاندەر بوون بۆ خراپە دەبێت بیر لە چارەسەر بکاتەوە، کە دواتر لە بەشی چارەسەر بە درێژی باسی دەکەین إن شاء الله.

**خراپترین ژینگە:**

١. کۆمەڵگا کە خراپەی لا ئاسایی بێت.

٢. خێزان.

٣. هاوڕێ.

٤. شوێنی کار.

٥. ئەو بە ناو مەساجەی کە ئەمرۆ باوە.

٦. بازاڕی خراپ.

٧. شوێنی لەش فرۆشی.

٨. بارەکان.

٩. شوێنی ڕەقص و سەما.
١٠. سینەما کە بە ئامانجی خراپ بە کاربێت.
١١. زۆر سەفەرکردن بۆ ئەو شوێنانەی کە تاوانی زینا بە ئاسایی دەزانن.
١٢. جۆری ڕۆشنبیری کەسەکە.
١٣. باگڕاوندی فکری.
١٤. میدیا، وەك ئەو کەسە کارمەند بێت لە دەزگایەکی ڕاگەیاندنی خراپ.

عەرەب دەڵێت: (الأشياء تعرف بأضدادها)، کەواتە لە میانەی باسکردنی شتەکان چارەسەرەکان ئاسانتر دەبن.

## هۆكاری بیست و دووەم: زیادبوونی شوێنی لەشفرۆشی و مەساج و سەماكردن

لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی (١٩٦٩)دا لە چەندین مادده و فەقەڕەدا هاتووە كە ئەو شتانەی زیان دەگەیەنن بە سومعە و كەرامەتی كەسێك یان لەگەڵ شەرم و حەیادا ناكۆكن سزای بۆ دانراوە، بۆ نمونە:

- لە ماددەی (٤٠١)دا هاتووە: ( يعاقب بالحبس مدة لا تزيد على ستة أشهر وبغرامة لا تزيد على خمسين دينارا أو بإحدى هاتين العقوبتين من أتى علانية عملا مخلا بالحياء).

ئەو دوو سزایە یان یەكێك لەو دوو سزایە بۆ كەسێكە كە كارێك دەكات بە ئاشكرا پێچەوانەی شەرم و شكۆیە.

- لە ماددەی (٤٠٢) فەقەرەی (أ)دا هاتووە كە تەنها داواكردن لە كەسێك نێر بێت یان مێ كە پێچەوانەی ئاداب بێت زیندانی و غەرامەی دارایی بۆ دانراوە.
- لە فەقەڕەی (ب)دا هاتووە هەر كەسێك مێینەیەك بێزار بكات بە قسە بێت یان بە كردەوە یان بە ئاماژە لە شوێنی گشتی بە شێوەیەك كە شكۆمەندی لەكەدار بكات، دیسان سزاكەی زیندانییە بە مەرجێك زیاتر نەبێت لە سێ مانگ و غەرامەی دارایی بە سی دینار یان یە كێك لەم دوو سزایە.

❖ لە ماددەی (٤٠٤)دا هاتووە كە سزای زیندانی لە ساڵێك زیاتر نەبێت یان غەرامەیەك سەد دینار بێت بۆ هەر كەسێك كە بە گۆرانی یان قسەی پیس و نارێك بۆ خۆی یان بە هۆی جیهازێكەوە كە شوێنی گشتی بێت خەڵك بێزار بكات.

ئێمە دە زانین زۆر شت لە یاسادا ڕێگە پێدراوە یان ئاسانكاری بۆ كراوە، بەڵام شتێك زیان بە كۆمەڵگا بگەیەنێت و تێكی بشكێنێت بە ئاشكرا هەم بە شەرع هەم بە یاسا ڕێگری لێكراوە، هەرچەندە یاسا لە وڵاتی ئێمە بە دەست دەسەڵاتدارانەوە لاوازبووە و كاریگەری كەمبووەتەوە بە داخەوە شوێنی لەشفرۆشی و مەساج و بە شێوەیەكی بەرچاو زیادی كردووە بەتایبەت ئافرەتانی وڵاتانی تر بەكاردەهێنرێن یان ئافرەتانی پارچەكانی تری كوردستان.

## هۆكاری بیست و سێیەم: بە تەنیا بوونی كوڕ و كچ (الخلوة المحرمة)

ئەمە شتێكی سەلمێنراوە كە ڕەگەزی كوڕ و كچ چەند بە یەكەوە كاریگەرن، بەتایبەت تەمەنی هەرزەكاری و تازەپێگەیشتوان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لایخلونّ رجل بامرأة و لاتسافرن امرأة إلا و معها محرم)[١].

واتا: هیچ پیاوێك لەگەڵ هیچ ئافرەتێك نەبێت بەتەنها، یان هیچ ئافرەتێك سەفەر نەكات بەتەنها مەگەر لەگەڵ مەحرەمی خۆی.

پێویستە ئەوە بگوترێت ئافرەتێك لە دائیرە دەوام دەكات كارمەندێكە لەگەڵ كۆمەڵێك كەس ئەوە بە خەڵوەت دانانرێ مادام خۆی بپارێزێت، یان ئافرەتێك سواری پاسێك دەبێت خەڵكی تری تێدایە، یان كە دەچێت بۆ حەج یان عەمرە، چونكە گەشتی حەج و عەمرە لە هیچ وێستگەیەكدا ئافرەت بە تەنها نییە، هەتا لە مەزهەبی شافیعیدا ڕێگا دراوە ئافرەت بە تەنها لەگەڵ ئافرەتانی متمانە پێكراودا حەج بكات[٢].

كەواتە با ڕێگر نەبین لە ئافرەتان چونكە بە هەزاران كەس پارەی هەیە و دەتوانێت حەج و عەمرە بكات و لە خۆی دڵنیاو ئەمینە و هیچ پاكانە و

---

١- صحيح البخاري: ١٨٦٢ – ٣٠٦١ – ٥٢٣٣، مسلم: ١٣٤١، سنن ابن ماجة: ٢٩٠٠، مسند أحمد: ١٩٣٤ – ٣٢٣١.

٢- الأم: للإمام محمد إدريس الشافعي: بەرگی ٣، ل ٢٩١، دار الوفاء.

بەهانەیەك نییە بۆ ڕێگری لێکردنی، مادام خوای گەورە حەجی لەسەر واجب کردبێت نابێت بە بێ بیانویەکی بەهێز وازی لێ بێنێت.

گرفتی (الخلوة) واتا بە تەنها بوونی کوڕ و کچ لەوەدایە کە سنورەکان بەزێندراون و تا ڕادەیەك بێ شەرعی بڵاوبووەتەوە ئەوەی خەلوەی بۆ حەرامکراوە هەندێك لە کوڕ و کچەکان ئەوە دەکەن یان لەوەش خراپتر، دەتوانن لە ڕێی ئینتەرنێتەوە بە هەموو شێوەیەك یەکتر ببینن و ڕازەکانیان بگۆڕنەوە بە پێی (قیاس الأولی) بێت ئەمە خراپترە لە خەڵوەکردن، چونکە ئەگەر خوای گەورە ڕێگری کردبێت لەوەی بەرامبەر دایك و باوکت بڵێیت: ئۆف، ئەی دەڵێی چی: کە خۆیان لێتوڕەکەی یان دەریانکەیت یان وەڵامیان نەدەیەوە یان نەفەقەیان نەکێشی یان کاربگاتە سوکایەتی پێکردن و لێدان؟! هەموو ئەوانە خراپترن لە ئۆف، کەواتە ئەوەی لە ڕێگای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەکرێت خراپترە لە خەڵوە (تەنیا بوونی کوڕ و کچ).

## هۆکاری بیست و چوارەم: زۆربوونی جیابوونەوەی هاوسەران (الطلاق)

گومان لەوەدا نییە کە شەریعەتی ئیسلام ئامانجی زۆر گرینگ دەپێکێت لە میانەی هاوسەرگیرییەکی تەندروست، بەڵام جاری وا هەیە ئامانجەکان یان بەشێك لە ئامانجەکان نایەنە دی، هەتا وای لێدێ سەردەکێشێت بۆ جیابوونەوەی هاوسەران. هەر بە کورتی ئاماژە بە هەندێك لە هۆکارەکانی تەڵاق دەکەین:

١. لاوازی ئیمان: هەرکامیان بە لایەوە ئاسایی بێت لەیەکجیابببنەوە لەوە تێنەگەیشتوون کە جیابوونەوە چەندین کارەساتی لێ دەکەوێتەوە لە توشبوون بە تاوان و بێوەفایی و ناشیرینکردنی دین و سوککردنی بنەماڵە و بەزایەدانی منداڵ و کەوتنەوەی دوژمنایەتی و ڕوودانی بوهتان و درۆ و گومانی خراپ.

٢. نا ڕۆشنبیری بەرامبەر بە ئەرکی هاوسەرگیری و بە کەم سەیرکردنی.

٣. لاساییکردنەوەی کوێرانەی کەسانی سەرنەکەوتوو لە زەواج.

٤. فرەژنی: زۆر کەس لەگەڵ فرەژنی توشی فەرامۆشکردنی خێزانەکەی تری یان خێزانەکانی تر دەبێت دواتر سەردەکێشێت بۆ تەڵاق.

٥. نەبوونی خۆشەویستی و گونجان بە یەکەوە.

٦. نەریتی کۆمەڵگا.

٧. ناپاکی هاوسەری (الخیانة الزوجیة).

٨. چاپۆشی نەكردن لە كەم و كوڕی یەكتر و هەڵنەگرتنی بەرپرسیارییەتی زەواج.
٩. توند مامەڵەكردن لە نێوان هاوسەران بە شێوەیەك یەكتریان پێتەحەمول ناكرێت و ناتوانن یەكتری قبوڵبكەن لەیەكجیادەنەوە.
١٠. كاریگەری كەس وكاری هەردوو لاو دەستوەردانی خراپ و نابەجێ.
١١. نەبوونی گفتوگۆ لە كاتی كێشە و گرفتەكان، كە زۆربەی كێشەكان بە گفتوگۆ چارەسەر دەبن.
١٢. داواكاری زۆری خێزان لە كاتێكدا بە پیاوەكە جێبەجێ ناكرێ، ئافرەتەكە چاو لە دەوروبەری دەكات كە داهات و سامانیان جیاوازە.
١٣. هەژاری و بێكاری.
١٤. جیاوازی زۆری تەمەن، ئەمە لە هەموو حاڵەتێكدا ڕاست نییە، بەڵام كاریگەری خۆی هەیە.
١٥. تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان بە ڕادەیەك كاریگەریان هەیە كە تەنانەت لە سەر جێگاش هاوسەران پشتیان لەیەك دەكەن و مافی سەرجێی و خۆشەویستی یەكتر نادەن.
١٦. سەفەركردنی زۆری پیاو كە ژنەكە هەستبكات بێ هاوسەرە.
١٧. میدیا بە تایبەت دراما بێخێر و ڕوخێنەرەكان.
١٨. جیاوازی دین و هزر.
١٩. پارە سەرف نەكردن و چروكی لە لایەن مێردەكانەوە.

٢٠. ڕێگری ئافرەت و نەدانی مافی سەرجێی پیاو.

٢١. جیاوازی لەسەر بوونی منداڵ و جۆری پەروەردەکردن و جێبەجێ کردنی داواکاریەکانیان، زۆر جار منداڵ بووەتە هۆی جیابوونەوە.

٢٢. پێنەگەیشتن و کامڵ نەبوونی هەردووکیان، ئەمە زۆر دەبینرێت کە هێشتا هاوسەرەکان منداڵن و لە بەرپرسیاریەتی و مافی هاوسەری تێناگەن.

٢٣. جۆری کارکردن لە لایەن هەر کامیانەوە بێت، جاری وا هەیە مێردەکە کارێك دەکات لەگەڵ سروشت و پەروەردەی ڕابردووی کچەکە نایەتەوە، وردە وردە دەبێتە هۆی جیاوازی و کێشە و دواتر جیابوونەوە.

٢٤. بڵاوکردنەوەی نهێنی و کێشەکانی ناوخۆیان کە دواتر خەڵکی خراپ و نادڵسۆز یان نەزان دێنە ناو باسەکە و دواتر سەردەکێشێت بۆ جیابوونەوە.

٢٥. بوهتانکردن بە یەکێکیان، زۆر جار ئەمە بووەتە هۆی جیابوونەوە، بۆیە لە شەرعدا بوهتانچی هەشتا داری لێدەدرێت و بە شاهێد قبوڵناکرێت مەگەر تەوبە بکات و خۆی چاك بکاتەوە.

٢٦. کەسێك ژنەکەی تەنها لەبەر دونیا و پارە مارە بکات دواتر کە وەك پێویست ئامانجەکەی نەهاتەدی، سارد دەبنەوە و گرفتەکانی تریش سەرهەڵدەدەن و لەوانەیە سەربکێشێت بۆ جیابوونەوە.

٢٧. جادووکردن و چون بۆ لای فاڵچیەکان.

٢٨. بەراوردکردنی هاوسەران لەگەڵ کەس و کاری خۆیان کە دەبینێت مێردەکەی ئەو وەك باوکی ئەو یان براکەی ئەو یان وەك زاواکەی تریان نییە، یان پیاوەکە بەراوردی دەکات لەگەڵ دایکی یان خوشکی یان ژن

خوشکێکی تری دەبینێت وا دەرناچێت، ئەمە کاتێك دەبێتە گرفت کە بە ڕاشکاوی دەگوترێت و دەبێت دەم بە دەم و کێشە دواتر لەگەڵ گرفتەکانی تر کەڵەکە دەبن و لەوانەیە ببێتە هۆی جیابوونەوە.

٢٩. ڕاوێژ نەکردن بە خەڵکانی پسپۆڕ لە کێشە خێزانی و کۆمەڵایەکان، کە بوونی ناوەندی ڕاوێژکاری گرینگە پێویستە لە هەر شوێنێکدا ئەوە هەبێت و ناوەند و نوسینگەی تایبەتیان هەبێت یان لانی کەم لە ناو دادگاکاندا هەبێت.

بێگومان ئەو هەموو ئافرەتانە کە لە مێردەکانیان جیادەبنەوە، بۆ هەر دوو لایان کارەساتە و هۆکارێکی سەرەکییە بۆ بڵاوبوونەوەی خراپەکاری.

ژمارەی ئافرەتانی بێوەژن و تەڵاقدراو لە دوو ملیۆن تێدەپەڕێت لە عێراقدا[١]. زۆربەی ئەوانەش گەنجن، بەشێکیان تەنها چەند مانگێك یان چەند ڕۆژێك بەسەر هاوسەرگیرییەکەیاندا تێپەڕیوە بۆیە، ئەرکی حکومەت بە گشتی و وەزارەتی پلاندانان و کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوەکان و مامۆستایانی ئایینی و ڕۆشنبیرانە بەتایبەتی بیر لەو کێشەیە بکەنەوە.

---

١- الصباح الجديد، جريدة يومية عراقية  سياسية مستقلة تصدر من بغداد، ١٧ – ١١ – ٢٠١٨.

## هۆکاری بیست و پێنچەم: بێکاری و دەستبەتاڵی

بێکاری لە هەر وڵاتێکدا هەبێت کێشە و گرفتی زۆر بە دوای خۆیدا دەهێنێت، بەتایبەت بۆ گەنجان کە زۆربەیان دەکەونە بیرکردنەوە لە خراپە و شوێنکەوتنی، وە دەبنە نێچیرێکی ئاسان بە دەست باند و مافیاکانەوە، لە کاتی بێکاریدا زۆربەیان لە گازینۆ و باڕ و شوێنە خراپەکاندا کۆدەبنەوە و بیر و ڕا و زانیاری ئاڵوگۆڕ دەکەن و ئاشنا دەبن بە شوێن و کارە خراپەکان، بۆیە ئەو وڵاتانەی ڕێژەی بێکاریان کەمە گرفت و ئاریشەیان کەمترە، بەڵام ئەوانەی ڕێژەی بێکاریان بەرزە خراپە و تاوان لە بەرزبوونەوەدایە، بەپێی ڕۆژنامەی وان نیوز[١] ڕێژەی بێکاری لە عێراقدا لە ساڵی ٢٠١٦دا بەرزبووتەوە بۆ ١٥%، بێگومان ساڵانی ٢٠١٧ – ٢٠١٨ زیاتریش بووە، ڕێژەی بێکاری لە ناو گەنجان گەیشتووەتە ٢٢%، کە ئەمە ئاماژەیەکی ترسناکە، ساڵانە هەزاران گەنج لە زانکۆکان دەردەچن بە بێ ئەوەی کەس دابمەزرێت و کەرتی تایبەت هەبێت هەلی کاریان بۆ بڕەخسێنێت، لە عێراق و هەرێمی کوردستان کەرتی بنەماڵە و حزب و بەرپرسان هەیە کەرتی تایبەت بە کردەیی زۆر زۆر لاوازە.

ئایا گەنج لە بێکاریدا بەو هەموو هۆکارەی خراپەکاری و ئامێرە ئەلیکترۆنیانە چۆن توشی تاوانی زینا و ماددە سڕکەرەکان نابێت ؟!

---

١- وان نیوز: ١٧ – ١١ – ٢٠١٦.

## هۆکاری بیست و شەشەم: بوونی خزمەتکاری بیانی و نامەحرەم

کورد دەڵێت: ماڵ بۆخۆی نەبوو میوانیش ڕووی تێکرد. ئەوە لەو وڵاتەی ئێمە قەوماوە، بۆ خۆمان دەیان دەرد و بەڵامان هەبوو ئەوەشی هاتە سەر کە هەندێك کۆمپانیا پەیدابوون خەڵکی بیانی دەهێنن و زیاتریش ئافرەتان گرێبەستیان لەگەڵدا دەکەن دواتر ئەوانیش هەڵدەستن بە گرێبەست لەگەڵ هەرکەسێك ئارەزومەند بێت بۆ خزمەتکاری ماڵەکان، لە ڕووی شەرعیەوە پیاو یان ئافرەت کاربکات لە دەزگایەکی حکومی یان کەرتی تایبەت یان ماڵان قەدەغە و بێشەرعی نییە، بەڵام بە یاسا و ڕێسای شەرعی نەوەك بە ڕەهایی و بێسنوری، لە وڵاتانی ئیسلامی بە گشتی و خەلیجی بەتایبەتی دەیان کارەساتی جەرگبڕ و ماڵوێرانکەر ڕویداوە، لە وڵاتی ئێمەش بە هەمان شێوە، بەڵام هێشتا لای ئێمە نەبووە بە مۆدێل و باو، بەڵام لەوانەیە ئەوە زیاتر پەرەبسەنێت لە داهاتوودا.

## هۆكاری بیست و حەوتەم: گەشت و گوزار (السفر والسياحة)

لە ڕوانگەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام گەشت و گوزار و گەڕان نەوەك قەدەغە نییە بەڵكو زۆر ئاساییە و هەندێك جار پێویستیشە و سودی زۆری هەیە.

**بەشێك لە سودەكانی ئەمانەن:**

١. مرۆڤ دەخاتە خۆشی و ئیسڕاحەت، چونكە كەسێك نەگەڕێ و بەردەوام هەر لەماڵەوە بێت هەست بە دڵ تەنگی دەكات.

٢. مرۆڤ فێری ئازایەتی پێویست دەكات بۆئەوەی تواناكانی ناخی بجوڵێنێت.

٣. شارەزای كەلتوری گەلانی تر دەبێت.

٤. فێری چەندین پیشە و كاری تر دەبێت كە لەوانەیە ئەو كارانە لە شوێنی خۆی هەر نەبن یان بە شێوەیەكی پێشكەوتوو نەبێت.

٥. زیاتر فێری یەكتر قبوڵكردن و لێبوردن دەبێت.

٦. فێری زمانی گەلانی تر دەبێت.

٧. هەست بە ئازادی و سەربەخۆیی دەكات چونكە تەواو پشت بە خۆی دەبەستێت.

٨. زیاتر متمانە بەخۆی دەكات و دەتوانێت بڕیاری گرینگ بدات.

٩. سەرنجی مرۆڤ كۆكراوەتر و تیژتر دەبێت بە هۆی ئەو هەموو شتە جیاوازانەی كە دەیبینێت و لە ڕۆتینات دەردەچێت.

١٠. دەستخستنی كەسابەت و كاری نوێ.

١١. دەرگا کرانەوە بۆ خوێندن و گواستنەوە بۆ شوێنی تر.
١٢. زیادبوونی دۆست و هاوڕێی جیاواز.
١٣. گیرا بوونی نزا و پاڕانەوە.
١٤. دڵخۆشکردنی ماڵ و منداڵ و کەسوکار.
١٥. زیاتر خۆشەویست بوونی وڵات و ئایین و خاك و خەڵکی خۆت، ئەوانەی کە بۆ ماوەیەك لە وڵات دوور دەکەونەوە خۆشەویستی خاك و خەڵکیان بۆ نویێ دەبێتەوە.
١٦. یادگارییەکان بۆ مرۆڤ زۆر دەبن کە بەردەوام مرۆڤ شانازی بە یادگارییە ناوازە و گرینگەکانی دەکات.
١٧. زیاتر بوونی ژیری و زانست.
١٨. کرانەوە بۆ گفتوگۆ و مونازەرە لەگەڵ دین و ژیار و ژینگە و کەسی جیاواز.
١٩. چارەسەری دەروونیە بۆ ئەو کەسانەی توشی خەمۆکی و نەخۆشی دەروونی بوون.
٢٠. شارەزایی وەرگرتن لە جۆری هاوڕێ و سروشت و تەبیعەتی جیاوازی خەڵك، تا لەگەڵ خەڵکانێك سەفەر نەکەی یان ترس ڕونەدات یان تەماع نەیەتە پێش کەسەکان دەرناکەون بە زۆریش ئەمانە لە سەفەردا دەردەکەون.

٢١. بەتایبەتیش بۆ ئەوانەی کە زەواج دەکەن گرینگی تایبەتی خۆی هەیە لە زۆر ڕووەوە بەتایبەت لەززەت لەیەکتر بینین و ئازادی و زیاتر یەکتر ناسین ...هتد.

٢٢. توانای ئەوەت بۆ دروست دەکات کە بە ئاسانی بڕیاری گواستنەوە بدەیت بۆ هەر شوێنێك کە بتەوێت.

٢٣. بێجگە لەوەی بواری گەشتیاری داهاتی گەورە بۆ وڵات پەیدا دەکات و چەندین سودی تریشی هەیە.

**پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی:**

تغرّب عن الأوطان في طلب العلا

وسافر ففي الأسفار خمس فوائد

واتا:

لە نیشتیمان دوورکەوە و سەفەر بکە لە پێناو وەدەستخستنی بەرزی

وە سەفەر بکە چونکە لە سەفەردا پێنج سودی گەورە وەدەست دەخەی

تفرج هم واكتساب معيشة

وعلم وآداب وصحبة ماجد

دەركردنی خەم و پەژارە، دەستخستنی ڕزق و ژیان

زانست و ئەدەب و هاوڕێی مرۆڤە گەورەكان

سافر تجد عوضا عمن تفارقه

وانصب فإن لذيذ العيش في النصب

سەفەر بكە بەدیل و جێگرەوەی ئەوانەت دەستدەكەوێت كە لێیان جیادەبیتەوە

خۆت ماندوكە چونكە تامی ژیان لە ماندوبووندایە

وإني رأيت وقوف الماء يفسده

وإن ساح طاب وإن لم يجر لم يطب

من بینیومە ئاو بەڕاوەستان بۆگەن دەبێت

ئەگەر بڕوات پاكە ئەگەر نەڕوات پاك نامێنێت

والأسد لولا فراق الغاب ما افترست

والسهم لولا فراق القوس لم يصب

شێر لە جەنگەڵستان لە لانە دەرنەچێت هیچ ڕاو ناکات

تیر کە لە کەوان دەرنەچێت هیچ ناپێکێت

والشمس لو وقفت في الفلك دائمة

لملَّها الناس من عجم ومن عرب

خۆر کە لەخولگەی خۆی ڕاوەستێت و نەجوڵێت

خەڵکی لە عەڕەب و عەجەم لێی بێتاقەت و وەڕەز دەبوون

والتبر كالترب ملقى في مكانه

والعود في أرضه نوع من الحطب

زێڕ لە شوێنی خۆی وەك گڵ فڕێدراوە

داری بۆنخۆش لە شوێنی خۆی کۆلکە و پوش و پەڵاشە

ئەگەر ئەمەیان (زێڕ) لە شوێنی خۆی لادرا و کۆکرایەوە بوو بە زێڕ، بە زەحمەت دەستدەکەوێت، چونکە بە قیمەت و بەها دەبێت، ئەگەر ئەوەشیان (داری بۆنخۆش) بردرا بۆ شوێنێکی تر وەکو زێڕەکە بە قیمەت و بەها دەبێت. بە ڕاستی پێشەوای گەورە ڕاستی فەرمووە جێگای بەهەشتی بەرین بێت.

## ئادابەکانی سەفەر

سەفەرکردن کۆمەڵێك ئاداب و یاسا و ڕێسای هەیە کە ئەو کەسەی گەشت دەکات پێویستە ڕەچاویان بکات، لەوانە:

١. ساغکردنەوەی نیاز و نیەت بەتایبەت کاتێك مرۆڤ سەفەر دەکات بۆ کارێکی گرینگ وەك خوێندن، چارەسەرکردن، یان بە وەفد ڕۆیشتن یان کۆڕ و کۆبوونەوەی زانستی، لە هەرشتێك مرۆڤ نیەت و نیازی خۆی بۆ خوای گەورە ساغ بکاتەوە بەرەکەت دەکەوێتە ژیان و تەمەنییەوە.

٢. مرۆڤ هەوڵ بدات پێش سەفەر کردن واز لە ستەم بهێنێت و مافەکان بۆ خاوەنەکانیان بگێڕێتەوە بەتایبەت کە بچێت بۆ حەج و عەمرە.

٣. ئیستیخارە کردن کە یەکێکە لە سوننەتە گرینگەکان وەك لە جابرەوە هاتووە و فەرمودەکەش بوخاری گێڕاویەتەوە[١].

٤. ڕاوێژکردن بەتایبەت بە زانایان و دڵسۆزان لە سەروشیانەوە دایك و باوك و خێزان منداڵەکان، ئەوانەی کە لەم تەمەنەدان کە پرسیان پێبکرێت، پرس و ڕا زۆر گرینگە چونکە مرۆڤ ئەزمون و ژیری خەڵکانی تر کۆدەکاتەوە و سودیان لێوەردەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ١٥٩﴾ [آل عمران: ١٥٩].

---

١-رواه البخاري: ٦٣٨٢.

٥. ئامادەكردنی توێشوی حەڵاڵ بۆ سەفەر.

٦. هاوڕێی باش زۆر گرینگە لە سەفەردا.

٧. ئەگەر كرا سەفەر بخرێتە ڕۆژی پێنج شەممە وەك لە فەرمودەدا هاتووە: (كان يحب أن يخرج يوم الخميس)[١]، لە ڕیوایەتێكی تردا: (لقلّما كان رسول الله يخرج إذا خرج في سفر إلا يوم الخميس)[٢].

٨. ئەگەر بكرێت سەفەر لە بەیانیاندا ئەنجامبدرێت، پێغەمبەری سەروەر ﷺ دەفەرموێت: (اللهم بارك لأمتي في بكورها)[٣].

٩. بە خوا سپاردنی ماڵ و منداڵ لەبەر فەرمودەكەی عبدالله كوڕی عمر ڕەزای خوایان لێبێت، دەفەرموێت: ئەگەر یەكێك سەفەری كردبا دەیفەرموو: وەرە با ماڵئاواییت لێبكەم و فێرت بكەم وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیكرد: (أستودع الله دينك و أمانتك و خواتيم عملك)[٤].

---

١- رواه البخاري: ٢٩٥٠.

٢- رواه البخاري: ٢٩٤٩.

٣- رواه الترمذي: ١٢١٢، ابن ماجه: ٢٢٣٦، سنن الدارمي: ٢٤٧٩، مسند أحمد: ١٥٤٣٨ – ١٥٤٤٣ – ١٥٥٥٧ – ١٥٥٥٨.

٤- الترمذي: ٣٤٤٢ – ٣٤٤٣، سنن ابن ماجه: ٢٨٢٦، مسند أحمد: ٤٥٢٤ – ٤٧٨١ – ٤٩٥٧ – ٦١٩٩.

١٠. ئەگەر سێ کەس بوون یەکێکیان بکەنە براگەورە، پێغەمبەری سەروەر ﷺ دەفەرموێت: (إذا خرج ثلاث في سفر فليؤمروا أحدهم)[١].

١١. ئەگەر دەرچوو دوعای سەفەر بکات: (عن أنس بن مالك أن النبي ﷺ إذا خرج الرجل من بيته فقال: بسم الله....)[٢].

١٢. وە ئەگەر سواری سەیارە یان فرۆکە یان کەشتی یان وڵاخ بوو سێ جار بڵێت الله أكبر: (كان إذا استوى على بعيره كبر ثلاثا)[٣].

١٣. لە بەرزاییەکان الله أكبر بکات[٤].

١٤. ئەگەر ئافرەت بوو بێ مەحرەم سەفەر نەکات، مەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەت بێت کە جێی متمانە بن.

١٥. ئەگەر وڵاخی لابوو با مافی وڵاخەکەی بدات، پێغەمبەری سەروەر ﷺ دەفەرموێت: (إذا سافرتم في الخصب فأعطوا الإبل حظها من الأرض)[٥].

---

١- مسلم: ٦٧٢، النسائي: ٧٨٢ – ٨٤٠، الدارمي: ١٢٨٩، مسند احمد: ١١١٩٠ - ١١٢٢٩٨.

٢- أبو داود: ٥٠٩٥.

٣- مسلم: ١٣٤٢.

٤- بخاري: ١٧٩٧.

٥- مسلم: ١٩٢٦.

١٦. هەتا شێوازی خەوتن و شوێنی خەوتن: ( إذا كان في سفر فعرس بليل اضطجع على يمينه...)[١].

١٧. پشو و ئیسراحەتدان بە وڵاخەكان، (عن أنس قال: كنا إذا نزلنا منزلا لا نسبح حتى تحل الرحال)[٢].

١٨. كۆبوونەوە لەسەر خواردن و خەوتن نەوەك بڵاوبوونەوە بە شیو و دۆڵەكاندا: (إن تفرقكم في هذه الشعاب و الأودية إنما ذلكم من الشيطان)[٣].

١٩. دوعا كردن لە كاتی دابەزین و بارخستن لە شوێنێك: (من نزل منزلا ثم قال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق. لم يضره شيء حتى يرتحل من منزله ذلك)[٤].

٢٠. دوعاكردن لە كاتی بەرزبوونەوە و دابەزین..... وەك جابر دەفەرموێت: (كنا إذا صعدنا كبرنا و إذا نزلنا سبحنا)[٥].

---

١- مسلم: ٦٨٣.

٢- أبو داود: ٢٥٥١.

٣- أبو داود: ٢٦٢٨.

٤- مسلم: ٢٧٠٨.

٥- بخاري: ٢٣٩٣.

٢١. دوعاكردن لە كاتی چونە ناو ئاوەدانییەك: (اللهم رب السموات السبع و ما أظللن و رب الأرضين السبع....)[١].

٢٢. دوعاكردن لە كاتی سەفەر: (ثلاث دعوات مستجابات لا شك فيهن: دعوة المظلوم، و دعوة المسافر، و دعوة الوالد على ولده)[٢].

٢٣. سرود و گۆرانی حەڵاڵ و دروست، لەبەر فەرمودەكەی ئەنەس كە دەفەرموێت: پێغەمبەری سەروەر ﷺ كەسێكی هەبوو بە (حداء)ی بۆ دەگوت بە ناوی ئەنجەشە[٣].

٢٤. هاوكاری كردنی هاوڕێ و ڕەفیق: (من كان معه فضل ظهر فليعد على من لا ظهر له)[٤].

٢٥. ئەوەی كە برا گەورەیە دەبێت لە دوایان بڕوات یان لە دوایان دابەزێت، نەوەك كەسێك پێویستی بە یارمەتی بێت یان شتێك بەجێبهێڵێت: (يتخلف في المسير و فيترجي الضعيف و يردف و يدعو لهم)[٥].

٢٦. ئەگەر كەسێكی خاوەن زانستیان لەگەڵ بێت خزمەتی بكەن، لەبەر فەرمودەكەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت كە دەفەرموێت: دە رچووم

---

١- رواه البيهقي في السنن الكبرى: ١٠٣٦، الحاكم: ١٦٣٤.

٢- الترمذي: ١٩٠٥.

٣- البخاري: ٦١٤٩ – ٦٢٠٢ – ٦٢٠٩ – ٦٢١٠ – ٦٢١١، صحيح مسلم: ٢٣٢٣.

٤- مسلم: ١٧٢٩.

٥- أبو داود: ٢٦٣٩.

لەگەڵ جەریری کوڕی عبداللەی بەجەلی لە سەفرێکدا ئەو خزمەتی دەکردم، گوتم: بۆ وا دەکەیت؟ وا مەکە، ئەویش گوتی: من ئەنصارەکانم بینیوە کە خزمەتی پێغەمبەری خوایان کردووە ﷺ، بۆیە سوێندم خواردووە هەر هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم دەبێت خزمەتی بکەم[١].

بەڵام نابێت کەسەکە بۆ خۆی داوا بکات کە ئەوەی لەگەڵدا بکەن، بەڵکو دەبێت هاوڕێکانی بەتایبەت گەنجەکان و کەم تەمەنەکان بەوە هەستن ئەوە شتێکی جوانە، خوای گەورەش لە سوڕەتی کەهفدا لە ئایەتەکانی: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ٦٠ فَلَمَّا بَلَغَا مَجۡمَعَ بَيۡنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ سَرَبٗا ٦١ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ٦٢﴾ [الكهف: ٦٠-٦٢]، باسی پێغەمبەر موسامان بۆ دەکات کە غولامێکی لەگەڵ بووە.

٢٧. سەگ و جەڕەس لەگەڵ خۆیاندا بەکارنەهێنن، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە، ئەو کاروانەی سەگ و زەنگوڵی تێدابێت فریشتە هاوەڵی نابێت: (إن العير التي فيها الجرس لاتصحبها الملائكة)[٢]، (لاتصحب الملائكة

---

١- مسلم: ٢٥١٣.

٢- رواه أجمد: ٢٦٢٣٠.

رفقة فيها كلب و لاجرس)[١]، وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی جەرەس دەفەرموێت: (مزمار الشيطان)[٢].

٢٨. مرۆڤ لە وڵاتە نا مسوڵمانەکان خۆی یەکلا بکاتەوە لەو خواردنەی کە بەکاری دەهێنێت، چونکە زۆر خواردن لەو وڵاتانەدا دەفرۆشرێت کە لە شەرعدا قەدەغەیە.

٢٩. سوننەتە مرۆڤ کە کارەکەی تەواو بوو زوو بگەڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (السفر قطعة من العذاب يمنع أحدكم من طعامه و شرابه و نومه، فإذا قضى نهمته فليجعل إلى أهله...)[٣]. واتە سەفەر بەشێکە لە سزا و ناڕەحەتی ڕێگری خواردن و خواردنەوە و خەو لە ئێوە دەکات، جا ئەگەر پێویستییەکەتان تەواو کرد پەلە بکەن بۆ گەڕانەوە بۆ لای کەس و کارتان.

٣٠. نابێت لە ناکاو و بێ هەواڵدان بگەڕێنەوە ماڵێ، بەتایبەت لە شەواندا وە بەتایبەتتر ئەگەر شەو درەنگ بوو، مەگەر پێشتر هەواڵی دابێت: (لايطرق أهله ليلا كأن يأتيهم غدوة أو عشية)[٤]، بەتایبەتیش کە دەمێك بێت لەماڵ نەبێت، وەك لە فەرموودەکەی جابردا زیاتر ڕونبووەتەوە کە

---

١- مسلم: ٢١١٣.

٢- أبو داود: ٢٥٥٦.

٣- البخاري: ٥٤٢٩.

٤- مسلم: ١٩٢٨.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذا طال أحدكم الغيبة فلا يطرق أهله ليلا)[١]، حیکمەتەکەشی ڕونکردووەتەوە کە دەفەرموێت: (حتى تستحر المغيبة وتمتشط الشحثة)[٢]، حیکمەتێکی تریش ڕوندەکاتەوە کە دەفەرموێت: (نهى رسول الله ﷺ أن يطرق الرجل أهله ليلا يتخونهم أو يلتمس عثراتهم)[٣].

**کەواتە ئەم حیکمەتانە بە ڕونی لە فەرموودەکەدا هەن:**

- ✓ بۆئەوەی ئافرەت مو لە خۆی بکاتەوە و خۆی برازێنێتەوە.
- ✓ بۆئەوەی بەدوای خیانەتی خێزانەکەی نەکەوێت و بەسەردا نەکەوێت، لەوانەیە لەم کاتەدا کەسێکی گوماناوی لە نزیك ئەو شوێنەدا وەستابێت بێ ئەوەی ئافرەتەکە ئاگای لێبێت.
- ✓ ڕێ لە پیاوان دەگرێ کە بە دوای عەیبی خێزانەکانیان بکەون، لەوانەیە لەو کاتەدا خێزانەکەی بۆنی ناخۆشی لێبێت یان بە شێوەیەکی ناشرین بەر چاوی بکەوێت و دواتر لێی بکات بە بیانو.
- ✓ جاری وا هەیە ئەم ئافرەتە لە ماڵ نییە و لە شوێنێکی ترە بەتایبەت لەمڕۆدا هۆکارەکانی گەڕان و سەفەرکردن ئاسان بووە.

---

١- البخاري: ٥٢٤٤.

٢- البخاري: ٥٢٤٦.

٣- مسلم: ٢٤٢٨.

٣١. پێویستە پێشوازی لەو كەسە بكرێت كە لە سەفەر دەگەڕێتەوە وەك عبداللەی كوڕی عباس دەفەرموێت: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەككە منداڵەكانی بەنو عبدالمطلب پێشوازیان لێكرد، یەكێكیانی لە پێشخۆی دانابوو لەسەر وڵاخەكەی و یەكێكی تریشی لە دوای خۆی دانابوو، عبداللەی كوڕی جعفر دەفەرموێت: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕایەوە لە سەفەرێك منداڵانی كەس و كاری پێشوازیان لێدەكرد)[١]، وە دەفەرموێت: جارێك كە لەسەفەر گەڕایەوە منیان پێش ئەوانی تر بردە خزمەتی لە پێش خۆی دایانام، دواتر منداڵێكی فاطمەیان هێنا لە پشت خۆی سواری كرد و چووینە ناو مەدینە سێ كەس سواری وڵاخێك بووین[٢].

٣٢. سوننەت وایە بەر لەوەی بچێتەوەماڵەوە بچێتە مزگەوت و دوو ڕكات سوننەتی تێدا بكات: (إذا قدم من سفر بدأ بالمسجد فركع فيه ركعتين ثم جلس للناس)[٣].

---

١- البخاري: ١٧٩٨.

٢- مسلم: ٢٤٢٨.

٣- البخاري: ٤٤١٨. مسلم: ٢٧٦١.

٣٣. سوننەته گه گەڕایەوه ماڵەوه بڵێت: (توبا توبا لربنا أوبا لایغادر علینا حوبا)[١]. واتا: خوایه گیان داوای تەوبه و گەڕانەوەی تەواوت لێدەکەم و بۆ لای تۆ بگەڕێینەوه و هیچ گوناهمان پێوەنەهێڵێت.

ئەمانه کۆمەڵێك ئاداب و ڕێنمایی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بوون بۆ سەفەر و گەشت و گوزار، بێگومان کەسێك ڕەچاویان بکات نەك هەر تەنها توشی زینا نابێت بەڵکو دەبێته سەفەرێکی پڕ خێر و هیدایەت و بەرەکەت بۆ خۆیی و هاوڕێکانی بۆ دونیا و دواڕۆژی[٢].

به داخەوه ئەمڕۆ گەشت و گوزار و سەفەر یەکێك له ئامانجه سەرەکییەکانی بووەته ڕابواردن و ناشەرعی.

---

١- مسند أحمد: ٢٣١١.

٢- بۆ ئادابەکانی سەفەر سودم وەرگرتووه له کتێبی (السفر آداب و أحكام)ی محمد صالح المنجد.

## هۆكاری بیست و هەشتەم: هەژاری و بێكاری

بێگومان هەژاری و بێكاریش یەكێكە لە هۆكارەكانی توشبوون بە تاوانی زینا، ڕەنكە زۆر كەس هەبێت بەتایبەت ئافرەتان كە بۆ دابینكردنی پێویستیەكانی ژیانی هیچی دەستگیر نەبێت، نا چار بیرلەوە دەكاتەوە لەڕێی تاوانی زینا داهاتێك بۆ خۆی دابین بكات، بەتایبەت لە ئەوروپا ڕێژەیەكی بەرچاو وەك ئامراز بەكاریدەهێنن، لەشفرۆشیان پێوەدەكرێت یان لانی كەم وێنە ئیباحی و ڕوتەكانیان بازرگانی پێوەدەكرێت. ئەگەر كەسێك داهاتێكی باشی هەبێت بیر لەو ڕێگایە خۆفرۆشیە و لەشفرۆشیە ناكاتەوە. هەژاری هۆكاری زۆری هەن كە دەكرێت چەندین توێژینەوەی وردی ئەكادیمی لەسەر بكرێت، بەڵام مەبەستمە لێرە شوێنەوارە خراپەكانی باس بكەم كە لە دیارترینیان توشبوون بە تاوانی زینا و لەشفرۆشیە بەتایبەت بۆ ئافرەتان.

### شوێنەوارە خراپەكانی هەژاری:

١. دروست بوونی لادانی ڕەوشتی بەشێوەیەكی بەرچاو، چونكە لە هەژاریدا تاك بیر لە هەموو خراپەیەك دەكاتەوە بۆ دابینكردنی داهاتی ڕۆژانەی.

٢. منداڵان ناتوانن بەهرەمەند بن لە خوێندن بە پێی ڕێكخراوی یونسكو بۆ منداڵان لە عێراقدا (٣,٥) ملیۆن منداڵ پێویستیان بە فێركردن و دابینكردنی شوێنی خوێندن و پێداویستییەكانە.

٣. پەیدابوونی دیاردەی کارکردنی منداڵان کە ئەمە کارەساتی زۆری لێدەکەوێتەوە.
٤. تێکچونی باری تەندروستی لە کومەڵگا بەتایبەت لەناو منداڵان بە هۆی بەدخۆراکی و نەبوونی.
٥. پەیدابوونی گەندەڵی لە هەموو بوارەکاندا بەتایبەت ئیدارە و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی.
٦. لە هەمووی خراپتر تاوانی زینا کە ئێستا بەدواداچوون بکرێت بە وردی دەردەکەوێت کە زۆرێك لە خێزان و گەنجەکان بە گشتی ئافرەتان بە تایبەتی توشی لەشفرۆشی بوون بە هۆی نەبوونی داهاتی پێویست.
٧. هەڵتەکانی خێزان.
٨. دواکەوتنی کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکانی ژیان.
٩. دەستبەسەرداگرتنی فکری و ئابوری و سیاسی بە ئاسانی.
١٠. شەڕی ناوخۆیی (أهلي) و پارچە پارچە بوونی وڵات.
١١. هەڵوەشانەوەی خێزان و پشتکردنە زەواج.
١٢. وڵات بەجێهێشتن و ڕووکردنە هەندەران بەتایبەت گەنجان.
١٣. لەدەستدانی وزە و هێزی زۆری گەنجان بە هۆی نەبوونی شوێنی پێویست بۆ کارکردن و بەدەرکەوتنی هێزی زانستی و داهێنان.

١٤. قۆستنەوەی هەژاری و بێکاری بۆ ویژدان کڕین و دروستکردنی مافیا و باندە تاوانکارییەکان.

کە دیارە ئەمانە لە سەرەکیترین شوێنەوارەکانی هەژارین، بەڵام شوێنەوارەکان زۆر لەوە زیاترن[١].

---

١- بۆ ئەم بابەتە سودم وەرگرتووە لە کتێبی: الفقر – أسبابه آثاره علاجه من منظور إسلامي: محمد قاسم الثوم، لاپەڕە ٣٣ – ٦٦.

## هۆکاری بیست و نۆیەم: سواڵکردن وماڵانگەڕی

ئافرەت لە ئیسلامدا خاوەنی شکۆ و ڕێزە، وە لە هەموو کاتەکاندا ژیانی دابینکراوە، ئەو کاتەی کە کچێکە لە ماڵی باوکی واجبە و پێویستە باوکی بە پێی توانا ژیانی دابین بکات، ئەو کاتەی خاوەنی هاوسەرە نەفەقە و پێویستییەکانی لەسەر هاوسەرەکەیەتی، ئەو کاتەش کە بە تەمەندا بچێت ئەگەر هاوسەرەکەی ژیانی پێ دابین نەکرێت ئەرکی کوڕەکانییەتی بە شانازیەوە دایکیان یان داپیرەیان بەخێو بکەن، ئەگەر ئەوان نەبوون بێگومان ئەرکی دەوڵەتە ژیانی هەژاران و نەداران دابین بکات بەگشتی و ئافرەتان بەتایبەتی.

کەواتە لەو کۆمەڵگایانەی کە ئافرەت قوڕسایی و بەڕێوەبردنی خێزانی دەکەوێتە ئەستۆ نیشانەی ئەوەیە دەوڵەت دەوڵەتی خەڵك نییە و کەمتەرخەمە و کۆمەڵگا مافی ئافرەتی پێشێل کردووە، وە ئافرەتیش لە مافەکانی خۆی بێ ئاگایە یان قەیرانی ئابووری گەورە ڕووی لە وڵات کردووە بە هۆی داگیرکاری یان شەڕی ناوخۆیی یان ئافات و بەڵا یان ئا پۆڕای زیادی خەڵك کە ئەمەیان کەمترین هۆکاری هەژارییە لە وڵاتانی ئێمە.

وە ڕەنگە کەسانێك کە سواڵ و ماڵانگەڕی دەکەن لێیان بووبێتە خو و وازی لێنەهێنن بەڵام ئەرکی دەسەڵاتە کە بەدواداچوون بکات بۆ ئەو حاڵەتە و بنبڕی بکات، ئەوەی کە بەڕاستی هەژارە ژیانی باش بکرێت بەتایبەت ئافرەتان، وە بەتایبەت ئەو ئافرەتانەی کە قوڕساییان کەوتۆتە سەر شان.

ئافرەتێکی گەنج و جوان لەسەر شەقامەکان سواڵ بکات یان ماڵانگەڕی بکات ئەو هەموو گورگە برسیەش لە ئارادا بێت چۆن تاوانی زینا ڕوونادات؟!

## هۆكاری سییەم: جیانەكردنەوەی كوڕ و كچ لەسەر جێگای خەوتن

یەكێكی تر لە هۆكارەكانی توشبوون بە تاوانی زینا ئەوەیە كە منداڵان لە تەمەنی منداڵی تا دوای منداڵی لەیەك جیاناكرێنەوە بەتایبەت لە قۆناغی هەرزەكاری، كە لایەنی جنسی بەهێزە لە هەردوو ڕەگەزدا، وە لەم ڕۆژگارەدا ئەم ئامێرە ئەلیكترۆنیانە بە بێ سانسۆر و چاودێری لە وڵاتی ئێمەدا بڵاوبوونەتەوە، ئەمە وا دەكات كە كوڕ و كچ نەتوانن بەسەر خۆیاندا زاڵبن، لە وڵاتانی ئەوروپی ئەم حاڵەتە زۆرە كە مەحرەمەكان[١] توشی زینا دەبن (زینا المحارم)، بەڵام لە وڵاتانی ئێمەدا تا ئەندازەیەكی باش چاودێری و كۆنترۆڵ كردنی بابەتەكە هەیە، بۆیە هیچ شتێك ڕێگر نییە لە توش نەبوون بەزینا كە دوو گەنج خوشك و برا یان مەحرەمەكانی تر بەیەكەوە دەخەون، هەر بۆیە یەكێك لە ئادابەكانی پەروەردەی منداڵ جیاكردنەوەی جێگاكانیانە بە پێی فەرموودەی سەروەرمان ﷺ كە دەفەرموێت: (مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين واضربوهم عليها وهم أبناء عشر سنين، وفرقوا بينهم في المضاجع)[٢]، واتا: لە حەوتساڵیدا فەرمان بە منداڵەكانتان بكەن بە نوێژ، وە

---

١- مەحرەم ئەوانەن كە بە یەكەتری ناشێن، وەك: خوشك و برا، و دایك و كوڕ، باوك و كچ، پور و برازا و خوشكەزا ....هتد.

٢- سنن أبي داود: ٤١١٣ – ٤١١٤، مسند أحمد: ٦٦٨٩ – ٦٧٥٦.

لە دەساڵیدا لێیان بدەن لەسەر نوێژ نەکردن، وە جێگای خەوتنیان لەیەکتری جیا بکەنەوە.

## هۆکاری سی و یەکەم: کاریگەری خراپی پەروەردە و فێرکردن

گومان لەوەدا نییە کە پەروەردە و فێرکردن بە هەموو ئەو چالاکیانەی کە لەگەڵیدا هاوکاتن گرینگن بۆ لایەنی پەروەردەیی، بەتایبەتی فەلسەفەی پەروەردەیی پێویستە ڕون بێت، ئایا ئەو سیستەمە دەیەوێت گەنجەکان بەرەو چ ئاراستەیەك ببات؟! ئایا دەیەوێت بیانکات بە مولحید و بێدین لە میانەی فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن یان دەیەوێت بیانکات بە کەسانی دڵسۆز و بەدین بۆ ولات و نیشتیمان؟! یان ئایا دەیەوێت گەنجان هانبدات بۆ گەڕان بە دوای زانست و داهێنان یان دەیەوێت تەنیا نەگوترێت لەو وڵاتە خوێندن نییە؟! ئەوەش بەوە دەردەکەوێت ئاخۆ ئەو وڵاتە لە چ ئاستێکدایە لە ڕیزبەندی زانکۆکانی جیهان یان ئەو خوێندکارانەی کە خوێندن تەواو دەکەن دیدگا و بۆچونیان دەربارەی دونیا و پێشکەوتن و خزمەتکردن چۆنە، ئایا ئەو دەزگا پەیوەندیدارە چ بۆ قوتابیەکان دەکات دوای تەواو بوون ڕاستە هەموو ئەمانە لە ئەستۆی پەروەردە و فێرکردندا نین، بەڵام جۆری پەروەردە و فەلسەفەی پەروەردە لەگەڵ وەزارەتی پلاندانان ئەم دوو وەزارەتە ڕۆڵی کاریگەری تێدا دەبینن، لە هەموو وڵاتانی دونیا فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن ڕونە لە بەردەم خوێندکاران و ڕۆشنبیران.

ئەگەر شۆرشی بەلشەفی ڕوسی بە نمونە وەربگرین بە ڕونی باس لە ئامانج و فەلسەفەی پەروەردەی ئەو وڵاتە دەکات.

(مدنسكى) بە ڕونی باس لە ئامانجەكانی فێركردن دەكات لە ڕوسیا بە خاڵ گرینگترین ئامانجەكان باس دەكات و لە خاڵی یەكەمدا دەڵێت:

پەروەردەی قوتابیان و مامۆستایان لەسەر بنچینە (تعالیم)ی ماركس و لینین و ستالینە، ستالین دەڵێت: لە ناو هەموو بەشەكانی زانستدا بەشێك هەیە كە پێویستە هەموو بەلشەفیەكان بیزانن ئەویش زانستی ماڕكس و لینینە[١].

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە كە دینی ئیسلام باشترین هاندەرە بۆ زانست و ڕەوشت و پێشكەوتن، بەڵام لە وڵاتانی ئیسلامی كە عەلمانیەت تێیدا باڵادەستە وانەكانی دین پەراوێز دەخرێن و دەدرێن بە مامۆستای نەشارەزا و دژە دین، وە دانانی ماددەی زۆر لاواز و جێگای دەمەتەقێ كە خوێندكار لە جیاتی دینی لا خۆشەویست بێت دەكەوێتە گومانەوە.

وە بەشی فەلسەفە بەتەواوەتی بەكاردەبردرێت بۆ لایەنی ئیلحاد و بێدینی، زانایەك دەڵێت:

(إن قليلا من الفلسفة يقرب إلى الإلحاد، و التعمق من الفلسفة يقرب إلى الله)، واتە: كەمێك لە فەلسەفە لە بێدینی نزیكت دەكاتەوە، وە قوڵبوونەوە لە فەلسەفە لە خوات نزیك دەكاتەوە.

---

١- غزو في الصميم: عبدالرحمن حسن حبنكي الميداني، ص٣١٧.

## هۆکاری سی و دووەم: چونە ماڵان بە بێ ڕەچاوکردنی ئادابە شەرعییەکان

ئەگەر هەر کەسێك ئادابی چونە ماڵان جێبەجێ بکات توشی شتی خراپ نابێت و چاوی بەسەر شتێکدا ناکەوێت کە بێ شەرعی بێت، بەڵام کەسێك بچێتە ماڵان بە بێ ڕەچاوکردنی ئەو ئادابە شەرعیانە بێگومان توشی شتی خراپ دەبێت، خاوەن ماڵ کە لە سەفەری دوور گەڕایەوە پێویستە ماڵەوە ئاگادار بکاتەوە وەك لە فەرمودەدا هاتووە، لە بابەتی چارەسەرەکان ئەو ئادابانە باس دەکەین بە پشتیوانی خوای گەورە.

## هۆكاری سی و سێیەم: وەسفكردن و باسكردنی ئەوەی كە لە نێوان ژن و مێردا ڕوودەدات یان وەسفكردنی خەڵك بۆ یەكتر مەبەستمان وەسفی ناشەرعییە

ئەم هۆكارە لە فەرموودەیەكی سەروەرمان ﷺ ڕونكراوەتەوە كە دەفەرموێت: (إن من شر الناس منزلة يوم القيامة رجل يفضي إلى امرءته و تفضي إليه ثم ينشر سرها)[١].

واتا: خراپترین كەس لە ڕوی پلە و پایە و ڕێز و حورمەتەوە لەلای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت ئەو پیاوەیە كە لەگەڵ خێزانی سەرجێی دەكات و دواتر نهێنی یەكتر ئاشكرا دەكەن و باسی دەكەن.

بێگومان كەسانێك كە ئەو كارە دەكەن و شتە تایبەتەكانی یەكتر باس دەكەن دەبەنگن و حورمەت و گەورەیی نهێنی ژن و مێرد نازانن.

---

١ صحيح مسلم: ١٤٣٧، سنن إبي داود: ٤٨٧٠، مسند أحمد: ١١٦٥٥.

## هۆکاری سی و چوارەم: بزوتنەوە فیمینیزمییەکان

مەبەست لە فیمینیزم ئەو جوڵانەوە ئافرەتیانەن یان مێینانەن کە هەوڵی یەکسانکردنی پیاو و ئافرەت دەدەن لە هەموو کایەکاندا، بەتایبەت هەندێك هەوڵ دەدەن بۆ باخی کردنی ئافرەت لە بەرامبەر پیاو.

لە ئیسلامدا پیاو و ئافرەت تەواوکەری یەکترن، نەوەك دوژمن و ناحەز نەوەك حکومەت و ئۆپۆزیسیۆن.

بۆیە دەبینین بەشێك لەو ڕێکخراوانە لەجیاتی ئەوەی ئافرەت فێری هونەری ژیان بکەن لەگەڵ هاوسەرەکانیان لە بارودۆخە جیاجیاکاندا، فێری ئەوەی بکەن کە هاوسەرەکەی هەژار بوو بەم شێوەیە ڕەفتار بکە یان کە نەخۆش بوو، یان کە قوتابی بوو، یان کە خەسوت لەگەڵدا بوو، یان نەخۆشی دەرونی هەبوو، یان ...هتد بەو شێوەیە ڕەفتار بکە، چونکە کەسێك هونەری ژیان نەزانێت لە کاتە ناخۆشەکان دەبێتە هۆی ئەوەی ئافرەت خیانەت لە مێردەکەی بکات و بە مافی خۆی بزانێت لەگەڵ هەر کەسێك بیەوێت ڕابوێرێت.

## هۆکاری سی و پێنجەم: فەتوای نابەجێ و بێسەروبەر

لەناو میللەتێکی مسوڵماندا فەتوا کاریگەری بەرچاو و یەکلاکەرەوەی هەیە لە کێشە و بۆچوونەکانی خەڵك.

بەردەوام لە فەتوادا توندڕەوی و شلڕەوی هەبووە، وە بەردەوامیش میانڕەوی و وەسەتییەت بووە.

هەیە ئاوی خۆ هێنانەوەی پێ شتێکی ئاسایی بووە بەبێ لەبەرچاو گرتنی بار و دۆخی کەسەکە زانایان کە فەتوایانداوە بۆ (استمناء) بەستویانەتەوە بە بارودۆخی زەروریەت، وەك کەسەکە یەقینی هەبێت و دڵنیا بێت کە توشی زینا دەبێت یان بە ڕێژەی لەسەدا پەنجا بۆ لەسەدا نەوەد و نۆ پێی وایە توشی زینا و بێ شەرعی دەبێت، ئەوە جیاوازە لەوەی کە بە ڕەهایی ڕێگای پێبدرێت لە کاتێکدا زیانی زۆر گەورەی تەندروستی لێدەکەوێتەوە و لایەنی جنسی کەسەکە توشی کێشەی گەورە دەکات، هەتا توشی ستەمی سێکسیش دەبێت لەگەڵ خێزانەکەی کاتێك کە زەواج دەکات.

پەروەردگار ڕێگای نەداوە بە سارکردنەوەی شەهوەت مەگەر لە ڕێگای خێزان و کەنیزەکی حەڵاڵەوە نەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ٧﴾ [المؤمنون: ٥-٧]، کەواتە تەنها لە ڕێگای خێزان و کەنیزەك سارکردنەوەی

شەهوەت ڕێگە پێدراوە، ئەگەر نا شکاندن و بەزاندنی سنورەکانی خوای گەورەیە، لە چەندین ئایەتدا هاتووە کە مرۆڤی مسوڵمان پێویستە پارێزگاری لە سنورەکانی خوای گەورە بکات و نەیانشکێنێ، بۆیە فەتوایەکی لەو جۆرە دەرگا دەکاتەوە بۆ خراپەکاری و تاوان.

یان ئەوانەی بەهەموو شێوەیەك گۆرانی و مۆسیقا حەرام دەکەن، یان ئەوانەی بەهەموو شێوەیەك حەڵاڵی دەکەن، بێگومان پێویستە ئاگاداربن کە داخستنی دەرگای حەڵاڵ لە بەردەم خەڵك توشی حەرامیان دەکات و پێچەوانەکەشی ڕاستە.

## هۆکاری سی و شەشەم: جێبەجێ نەکردنی حوکمە شەرعییەکان

خەڵکانی بێدین کاتێك ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن بەوە تاوانباری دەکەن کە توندڕەو و بێ ڕەحمە لە جێبەجێ کردنی حوکمە شەرعییەکان، بەڵام ئەگەر ڕابمێنین لە حوکمە شەرعییەکان بەتایبەت حەددەکان دەبینین کە پێچەوانەکەی ڕاستە.

ئێمە کە تەنها حوکمی زینا وەربگرین وەکو نمونە بۆئەوەی بزانین ئایا ئیسلام توندە لە جێبەجێ کردنی ئەم حەددە، بۆمان دەردەکەوێ کە بە پێچەوانەوە ئیسلام ڕێگایەکی گونجاوی داناوە بۆ نەهێشتن یان کەمکردنەوەی تاوانی زینا کە ئەم کتێبە هەمووی تەرخانکراوە بۆ هۆکار و شوێنەوار و چارەسەری زینا، کە ئێمە لە باسی چارەسەرەکاندا باسی دەکەین بە پێی پێویست.

پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە ١٦ جار ماعزی ئەسلەمی تەلقینکرد - واتا: تێیگەیاند - کە دان نەنێ بەتاوانەکەی بەڵکو وازبهێنێت و تۆبە بکات.

لە بوارەکانی تریشدا هەروایە، شەرع چۆن دەستی دز دەبڕێت تاکو بیانوی دزیکردنی نەبڕێت؟! بۆیە زانایان بنچینەیەکی جوانیان داڕشتووە بە خوێندنەوەی کۆی شەریعەت ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: (رعاية الحقوق أولى من إقامة الحدود)، واتا: پێدان و ڕەچاوکردنی مافەکان لەپێشترە و شایەنترە لە جێبەجێکردنی سنورەکان (الحدود).

لەگرینگترین چارەسەرەکان ڕەچاوکردنی حاڵەتی کۆمەڵگا و تێگەیشتن و ئامادەبوونیەتی بۆ وەرگرتنی حەددە شەرعییەکان.

## هۆكاری سی و حەوتەم: لاسایی كردنەوەی كوێرانە

بەداخەوە یەكێك لە كوشندەترین دەردی كۆمەڵگاكان لاسایی كردنەوەی كوێرانەیە، ئینجا یان بۆ بێگانە یان بۆ نەریتی خراپی عەشیرەت و ناوچە، یان باب و باپیران كە لە قورئانی پیرۆزدا (اتباع و تقلید) باسكراوە، تەقلید بە زەم و گازندە نەبێت باس نەكراوە، ئەوە مانای ئەوە نییە كە هەموو كەس شایانی نەزەر و تێڕامانە، جاری وا هەیە كە زانای گەورەش لە بابەتێكی مەترسیداری هەنوكەیی ناچار بە گواستنەوەی قسەی زاناكانی تر دەبێت، بەڵام ئەو لەو كاتەدا بەراورد دەكات كامەیان بۆ ئەو بابەتە گونجاوترە ئەوەیان هەڵدەبژێرێت، كەواتە ئەوە بە مانای لاسایی كردنەوەی كوێرانە نایەت، مەبەستی ئێمە زیاتر ئەوەیە كە بڵێین لاسایی كردنەوەی كوێرانەی ڕۆژئاوا لە شتە خراپەكان.

بەتایبەت ئەو هەموو مۆدێلات و ڕەقس و سەما و مۆسیقای خراپ (ماجن) كە هیچ بەهایەك ناهێڵێت، لەكاتێكدا سەركردە و زاناكانی ئەوان دەمێكە هاوار دەكەن بە دەست ئەو هەموو تاوان و جەریمە كە بەهۆی بەرهەڵدایی و ئیباحیەتەوە ڕوودەدات، وە زۆریشمان دەزانین كە چ دەستێكی بۆگەن كاردەكات بۆ مەستكردن و بێ ئاگاكردنی گەنج، وە چەند ئاسانكاری دەكرێت بۆ خراپە، وە چەند ڕێگری دەكرێ لە كاری باش و چاككردنی ڕەوشتی كۆمەڵگا، وە چەند سامانی میللەت بە دزی و گەندەڵی سەرفدەكرێت

لە پێناو چەند کەسانێکی خراپ کە کاریان ئەڵقە لە گوێی و جێبەجێکردنی ئەجێندای ناحەزان و دوژمنانە.

گرفتەکە ئەوەیە کە ئێمە لە کارە باشەکان لاسایی ناکەینەوە بەڵکو تەنها لەو شتانە کەزیانی بۆ ئێمە هەیە لاساییان دەکەینەوە، بۆیە لەمڕۆدا لاساییکردنەوەی خراپ یەکێکە لە کاریگەرترین هۆکارەکانی زینا.

## هۆکاری سی و هەشتەم: داگیرکاری

شتێکی ڕونە کە داگیرکەر بۆ مەرامی تایبەتی خۆی وڵاتێکی تر داگیر دەکات، هەرگیز نەبووە یەکێك داگیرکاری بکات لە بەرژەوەندی داگیرکراو.

ئایا ئەمریکا بۆ بەرژەوەندی عێراق عێراقیان داگیرکرد، ئایا ڕوسیا و هاوپەیمانەکانی بۆ بەرژەوەندی سوریا ئەو وڵاتەیان وێرانکرد ؟

ئایا فەڕەنسا بۆ بەرژەوەندی لوبنان و مەغریب و جەزائیر ئەو وڵاتانەی داگیرکرد ؟

لە کۆی زیاتر لە ١٩٠ وڵاتی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەدا حەفدەی زیاتر لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا بوو بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتە.

شتێکی ڕونیشە کە داگیرکراو کاریگەرە بە داگیرکەر و لاسای دەکاتەوە و بە چاوی عەزەمەت و گەورەیی بۆی دەڕوانێت، بە ناچاری ملکەچی یاساکانی دەبێت و ناچار دەبێت لە بەردەستی ئەودا کاربکات.

لە ڕوی زمانەوانی و کەلتور و ئەدەب و ڕەوشت و لە هەموو بوارەکان پێی کاریگەر دەبێت، بەتایبەت وڵاتانی ئەوروپی کە ئیباحیەت تێیدا لە لوتکەدایە بۆیە سەیر نییە هەمان دەرد و ئافات بگوازرێتەوە بۆ ناو وڵاتە داگیرکراوەکان کە بابەتەکە هێندە ڕونە من هیچ بەڵگەی بۆ ناهێنمەوە.

## هۆکاری سی و نۆهەم: بیانو گرتن بە قەزا و قەدەر

سروشتی مرۆڤ وایە کە تاوانی کرد حەزدەکات پاساوی بۆ بهێنێتەوە، بۆیە شەیتان کە تاوانی ئەنجامدا گومڕاکردنی دایە پاڵ خوا و گوتی: ﴿بِمَآ أَغْوَيْتَنِي﴾ [الأعراف: ١٦]، واتە: بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاکرد، بەڵام ئادەم گوتی: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾ [الأعراف: ٢٣]، واتە: خوایە گیان ستەمیان لە خۆمان کرد.

بۆیە هەرکەس بیانوی بە قەدەر گرت ئەوە ڕێچکەی شەیتانی گرتووە، وە هەرکەس خۆی تاوانبار کرد و پەشیمان بوو لە تاوانەکەی ئەوە بێگومان ڕێچکەی ئادەمی گرتووە، ئادەم تۆبەی لێوەرگیرا و بوو بە پێغەمبەر ﷺ، بەڵام شەیتان بوو بە دوژمنی خوا و لە ڕەحمەتی خوا وەدەرنرا.

چەندین قسە و شیعریش هەیە کە ڕێگا بۆ ئەمە جوان و ئاسان دەکات، بۆ نمونە خیام دەڵێت:

ئەی خوایە لە کارت زانا سەری گێژە   شیرنایی دەخەیە سەر دەم و دەڵێی مەیچێژە
خۆت جوانی دروستدەکەی و دەڵێی مەیبینە   پیاڵە پڕ ئاوە لاری کەوە و مەیڕێژە[1]

خوا داوی ئەناوە داوی ئەو بانادەم   دەعبایەکی گرت و ناوی لێنا ئادەم
ڕاوی ئەوە داوی ئەوە دانەش هی   ئەو دەمخاتە تەڵە و گەرەکیە خۆشم لادەم[2]

---

١- چوارینەکانی خیام: وەرگێڕانی مامۆستا هەژار، پەخشانگای ئازادی.

٢- چوارینەکانی هەژار، لاپەڕە ٣١.

قەزا و قەدەر بۆ کەسێك بڕوای بە خوا بێت زۆر ڕونە، چونکە:

١. خوای گەورە کار لەجێیە هەرچی دەیکات لە جێی خۆیدایە.

٢. خوای گەورە دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، هیچ بەربەستێك ناتوانێت پەکی بخات و دەستەوەستانی بکات.

٣. هەرچی بیەوێ دەتوانێت بیکات.

٤. ستەمی حەرامکردووە لەسەر خۆی و بەندەکانی.

٥. دادوەری واجبکردووە لەسەر خۆی و بەندەکانی.

لەگەڵ بەندەکانی بە بنچینەی چاکە (الفضل) تەعامل و مامەڵە دەکات نەك لەهەموو کاتێکدا بە بنچینەی داد (العدل)، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ٦١﴾ [النحل: ٦١]، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا٤٥﴾ [فاطر: ٤٥].

٦. ئەوانەش کە بیانو بە قەزا و قەدەر دەگرن تەنها بیانوە ئەگەرنا بۆ هیچ شتێکی تر لە ژیانیاندا باسی قەدەر ناکەن، بۆ نمونە، بڵێ: نان مەخۆ قەدەرە، ئاو مەخۆوە قەدەرە، شوو مەکە قەدەرە، مەڕۆ بۆ دەوام قەدەرە، مەخوێنە قەدەرە، عیلاج مەخۆ قەدەرە، پارە پەیدا مەکە قەدەرە، بۆ هیچ

شتێك لەوانە بیانو بە قەدەر ناگرن، ئەوە بەڵگەیەکی ڕونە کە ڕاست ناکەن، وە إن شاء الله لە باسی چارەسەرەکاندا ڕونی دەکەینەوە.

## هۆكاری چلەم: ئاسانكاری یاسایی

لە هەموو ئەوروپا زینا بە تاوان دانانرێت بەڵكو زەواج و هاوڕەگەزیش تاوان نییە، تەنانەت لە هەندێك وڵات بە یاساش ڕێكیان خستوە.

وە زینا لەگەڵ مەحرەمیش بە تاوان دانانرێت مەگەر دەستدرێژی سێكسی هەبێت.

لە وڵاتانی ئیسلامیش كاتێك لێپێچینەوە دەكرێت كە سكاڵا بەرزبكرێتەوە، وە ئەگەر یەكێك لە شوێنێك تاوانی زینا ئەنجام بدات ناتوانرێت ڕێگریشیان لێبكرێت مادام بە ڕەزامەندی هەردوولابێت و خێزان و مەحرەمت نەبن، بێگومان ئەوە وا دەكات كاری زینا ئاسان و بە یاسایی بكرێت.

## هۆكاری چل و یەكەم: زەواجی كاتی و هاووێنەكانی

زۆر كەس هەیە لە شەریعەت و ئامانجەكانی تێناگات، یاخود نایەوێت تێبگات بیانو بە هەندێك دەق دەهێنێتەوە، كە گوایە بەڵگەیە لەسەر شەرعیەتی زەواجی كاتی، بێ ئاگا لەوەی كە ئەوە تەنیا قۆناغێك بووە لە قۆناغەكان، هەروەك شەریعەت لە یەكەم ساتەوە هەموو شتێكی حەرام نەكرد بەڵكو پێ بە پێ واتا بە (التدرج) تاوانەكانی حەرام و یاساغ كرد، لە وانەش زەواجی كاتی كە مەزهەبی شیعە نەك بە ڕەوا بەڵكو بە دروشمی دین و جیاكەرەوەی خۆیانی دەزانن لە مەزهەبەكانی تردا.

ئێمە دوایی ئەمە ڕوندەكەینەوە، بەڵام بە پێویستی دەزانم ئەو بنچینە شەرعییە بخەمە بەرچاوی خوێنەران كە دەفەرموێت: (الاعتبار بكمال النهاية لا بنقص البداية).

زەواجی مەدەنی و زەواجی فرێندی و زەواجی عورفی و زۆر جۆری تریش هەن كە ئەمانە جۆرێكن لە زینا. لە چارەسەرەكاندا إن شاء الله كەمێك ئاماژەیان پێدەدەین.

دەشتوانن بۆ بەرچاوڕونی لەسەر ئەو جۆرە زەواجانە سەرنج بدەنە ئەو كتێبانە:

- ✓ الأنكحة المنهي عنها: نوسینی تحسين بيرقدار.
- ✓ الأنكحة الفاسدة: عبدالرحمن بن عبد الرحمن شميلة الأهدل.
- ✓ نكاح المتعة بين الإباحة و التحريم: أحمد عوض أبو شباب.

زەواج لە ئیسلامدا کۆمەڵێك ئامانجی گەورە لەخۆدەگرێ لەوانە:

١. جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە.
٢. شوێنکەوتنی پێغەمبەران (علیهم السلام).
٣. زیادکردنی وەچە.
٤. مانەوەی جۆری ئینسانی و بەردەوامی ژیان.
٥. پەیوەندی کۆمەڵایەتی.
٦. فراوانبوونی بازنەی بەرپرسیاریەتی.
٧. ئارامی.
٨. خۆشەویستی.
٩. ڕەحمەت و بەزەیی بەیەکتردا هاتنەوە.
١٠. لەش ساغی و تەندروستی.
١١. وێناکردنی ئیسلام بە شێوازە هەرە جوانەکەی.
١٢. پاراستنی خێزان.
١٣. دروستبوونی نەسەب.
١٤. تەوابوون و کامل بوونی دینداری.
١٥. داوێنپاکی (العفة).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دروستکردنی خێزان و کۆمەڵگایەکی تەندروست و دوور لە هەڵوەشانەوە و داڕمان، بێگومان هیچ کام لەوانە لەگەڵ زەواجی موتعە یەکناگرنەوە، چونکە زەواجی موتعە ئەمانە نایەنێتە دی، نکوڵی لەوەش

ناکەین کە لە سەرەتای ئیسلامدا هەبووە، بەڵام لە سەرەتای ئیسلام ڕۆژو و زەکات و حیجابیش واجب نەبووە و ڕیباش حەرام نەبووە، بەڵکو زۆربەی ئەحکامەکان لە قۆناغی مەدەنیدا دابەزیون، هەروەها باسی ئەو هەموو ڕیوایەتە درۆینانە ناکەم کە لە مەدحی موتعەدا هێنراون و ناوی دینیان لێنراوە، هەر ئەوەندە بەسە کە هیچ کام لە ئیمامە گەورانەی کە شیعە بە ئیمامی خۆیان دەزانن ئەنجامیان نەداوە و نەیانکردووە.

شیعەش بۆ کچ و خوشکی خۆیانی بەڕەوا نازانن، لە کاتێکدا ڕیوایەت دەهێنن کە دەڵێت: دروستە لە یەك کاتدا لەگەڵ حەفتا دانەدا موتعە بکرێت، ئێستاش دەبینین کە چ کارەساتێکی منداڵی بێشەرعی و نەخۆشییە سێکسیەکانی لێکەوتۆتەوە، ئەسڵ لە زەواجدا بەردەوامی و بەیەکەوە ژیان و وەچەخستنەوە و ئارامی و ئاسودەییە، لە ڕاستیدا من هیچ جیاوازیەك لە نێوان موتعەی ئێستا و ئیباحی ئەوروپادا نابینم، بەڵام کارەساتەکە ئەوەیە موتعە بەرگی دینی بە بەردا کراوە و بۆتە شێوازێك بۆ ڕاکێشانی گەنجان بۆ ناو ئەو مەزهەبە.

## هۆکاری چل و دووەم: کۆمەڵێك زەواج کە لەمڕۆدا ڕێخۆشکەرن بۆ زینا

١. زەواجی موتعە: باسی زەواجی موتعەمان کرد و باسی ناکەینەوە.

٢. زەواجی فرێند: ئەو زەواجەیە کە هەردوو ڕەگەز پێکدێن بە مەرجە شەرعییەکان، بەڵام هەر کامیان لە ماڵی خۆی دەبێت، یان لە ماڵی یەکێکیان دەبێت بە پێی گونجان، دیارە لەم زەواجەدا ژن و مێرد ناتوانن بە تەواوی مافی یەکتر بدەن، وە ناتوانن ماڵێکی جوان بۆ خۆیان دروست بکەن، وە کەمتر دەتوانن منداڵ بخەنەوە، وە دەرفەت بۆ ناپاکی هاوسەری (خيانة الزوجية) زیاتر دەبێت[1].

٣. الزواج العرفي: بریتییە لەو عەقد و گرێبەستەی کە لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا دەکرێت جا مەرجەکانی تێدابن یان نا یەکسانە، وە بە ڕەسمی نەکراوە لە ڕێی عەقدی زەواجەوە.

یان ئەو عەقدەیە کە لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکە ئەنجام دەدرێت بە تەواوی مەرجە شەرعییەکانەوە، بەڵام لە فەرمانگە حکومییەکان بە فەرمی نەکراوە، تائێرە زۆر گرفتی نییە، بەڵام ئەو زەواجە لەو سنورە ڕانەوەستاوە بەتایبەت لە میسڕ ئەو زەواجە بەو جۆرە دەکرێت، بەزۆری خوێندکاران ئەوە دەکەن پارچە وەرەقەیەك وەردەگرن لە نوسینگەیەك کە لێی نوسراوە عەقدی زەواجی عورفی بەبێ ئەوەی ئامادەیی و شایستەییەکانی زەواج لە

---

١- الأنكحة المنهي عنها في الشريعة الإسلامية: تحسين بيرقدار، دار ابن حجر، ص ٥٦٨.

هەردووكیاندا هەبێت، ئەوە پێی دەڵێن: زەواجی عورفی، كە گومان لەوەدا نییە ئەم جۆرە زەواجە بێشەرعییە، لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

أ- زەواجێكی نهێنییە.

ب- بێ وەلی ئەمر و شاهێدە.

ت- ئەوان بەم جۆرە زەواجە هەموو حەقێكی ژن و مێردایەتی مومارەسە دەكەن لەسەر شێوەی یەكەم بێت و لەسەر پێناسەی یەكەم بێت هەر ئامانجەكانی زەواج ناپێكێت[١].

٤. الزواج المدني: بەو عەقد و زەواجە دەگوترێت كە لە نێوان هەردوو ڕەگەز ڕوودەدات بەو شێوازەی دەوڵەت دیاری كردووە، بەبێ هیچ حیساب كردنێك بۆ وەلی ئەمر و شاهێد.

دیارە ئەوە مەبدەئی عەلمانیەتە كە جیاكردنەوەی دینە لە دەوڵەت، وە تەنها دەوڵەتیش دەتوانێت بڕیاری جیاكردنەوەیان بدات، واتا دەبێت بەڕەسمی زەواج و جیابوونەوەكە لە فەرمانگەی حكومیەوە بكرێت وە دان بە هیچی تردا نانرێت، گومان لەوەدا نییە كە ئەو زەواجە هیچ قەدر و ڕێزێك بۆ دین و كۆمەڵگا و عورفی جوان ناهێڵێتەوە، وە جیابوونەوەی زۆری تێدا ڕوودەدات، چونكە تەواو بواری كۆمەڵایەتی تێدا فەرامۆشكراوە[٢].

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ٥٣٨.

٢- هەمان سەرچاوە، ص ٥١٧.

٥. الزواج بدون إيجاب وقبول: پێویستكردن و قەبوڵكردن و بەڵگەی ڕەزامەندییە لە هەردوو تەرەفەوە واتا لە وەلی ئەمر و كەسی داخوازی كار، یان لە نێوان كوڕ و كچەكە وەك لە زەواجی مەدەنی و هەندێك جۆری زەواجی تردا هەن.

هەرچەندە دەكرێت ئیجاب و قەبوڵ بە چەندین شێوە بكرێت، گرینگ ئەوەیە مەرجەكانی تری تێدا بێت، بەڵام لە ئێستادا ئەمە بە چەند جۆر ئەنجام دەدرێت، ئەم جۆرە ئیجاب و قەبوڵە لەجیاتی هەموو شتەكانی تر بەكاردێت، وەك وەلی ئەمر، شاهێد، مارەیی.

هەندێك لەو جۆرە ئیجاب و قەبوڵانەی كە بوونەتە باو:

أ- زەواجی خوێن: هەر دوولا هەڵدەستن بە برینداركردنی دەستی خۆیان، پاشان خوێنەكان تێكەڵ دەكەن گوایە ئەمە زەواجە.

ب- زەواجی خاڵ: هەردوولا دەچن بۆ لای خاڵكوت یان تاتۆكار، داوای لێدەكەن ناوی كچەكە لەسەر لاشەی كوڕەكە بنوسێت و بە پێچەوانەشەوە، گوایە ئەمە زەواجە و نیشانەی ڕەزامەندییە لەسەر زەواج.

ت- زەواجی لێو: هەردوولا واتا كوڕەكە و كچەكە دەچنە پەنایەك ماچ دەگۆڕنەوە بە گەرمی گوایە ئەوە بەڵگەی ڕەزامەندی هەردوو لایە.

ث- زەواجی كاسێت: هەر لایەكیان كاسێتێك تۆمار دەكات كە كەسی بەرامبەری خۆشدەوێت، پاشان ئەویتر گوێی بۆ دەگرێت و قەبوڵی دەكات، گوایە ئەمە زەواج و ئیجاب و قەبوڵە.

ج- زەواجی چاپ: لە پارچە كاغەزێكی چاپكراو كورەكە، بۆ نمونە: ئەم پارچە لەزگە چاپكراوە بە ناوچاوانی خۆیەوە دەلكێنێ، وە لەدوای چەند خولەكێك دەیدات بە كچەكە ئەویش هەمان شتدەكات، دواتر گوایە بۆیەك حەلاڵن و مومارەسەی ژن و مێردایەتی دەكەن[1].

**هۆكارەكانی ئەم جۆرە زەواجانە:**

١. تێكەڵاوبوونی بێسنور لە زانكۆ و ئامادەییەكان.
٢. وروژانی زۆر بەهۆی ئەو هەموو هۆكارانەی كە هەن لە بوارە ئەلیكترۆنییەكان و كەناڵە ئاسمانیەكان.
٣. زۆری مارەیی و نەفەقات.
٤. كەمبوونەوەی لایەنی دینداری.
٥. ئاسانكاری و ڕەواجدان بۆ ئەم بوارانە، لەڕێی میدیا و ڕێكخراوەكانەوە.

ح- نكاح المحلل: مارە بە جاش یان زەواج بۆ حەلاڵكردن: مەبەست لەو جۆرە زەواجەیە كە كەسێك لە خێزانەكەی جیادەبێتەوە بە یەكجاری و دوای سێ تەلاق، بەڵام دوایی بۆ یەكتری پەشیمان دەبنەوە، ناچار پەنا بۆ ئەوە دەبەن كە ئەو ژنە شوو بەكەسی دووەم بكات، بۆئەوەی دواتر بۆ مێردی یەكەمی حەلاڵ بێتەوە، واتا: كەسی دووەم بە مەبەستی ئەوە مارەی دەكات كە تەلاقی بدات و بگەڕێتەوە لای مێردی یەكەمی، ئەگەر بێت و

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ٥١٣ - ٥١٤ .

ئەمە بە وشەش نەگوترێت هەر هەمان مەبەستە، زانایان ئەو جۆرە زەواجەیان بە حەرام و گوناهی گەورە داناوە، چونکە زەواجی دووەم (کە بە نیەتی جیابوونەوە دەکرێت) ئامانجەکانی هاوسەرگیری تێدا نییە، کە ئێمە چەند جار ئاماژەمان پێداوە و چەندین فەرموودەشی لەسەرە کە ئەم جۆرە زەواجە دروست نییە و تاوانە، من لێرەدا بەڵگەکان باس ناکەم، چونکە ئەو نوسینە بۆ ئەو بابەتە نییە، بۆیە باسیان دەکەین چونکە لە زۆرکاتدا سەردەکێشێت بۆ تاوان و زینا و هەڵتەکاندنی خێزان و کۆمەڵگا[١].

خ- زواج السر: زەواجی بە نهێنی: مەبەست لەو زەواجەیە کە شاهێدی تێدا ئامادە نابێت، مێردەکە و وەلی ئەمر دەیانەوێ کارەکە بە نهێنی بێت، یان فەرمان بە شاهێدەکان دەکەن کە ئەو کارە لای هیچ کەس باس نەکەن و بە نهێنی بیهێڵنەوە.

**ئایا ئەم زەواجە دروستە یان نا ؟**

ڕای پەسەند ئەوەیە کە دوو کەس یان زیاتر ئامادەبن وەك شاهێد پێی ناگوترێت: زەواجی نهێنی و حەرامیش نییە، بەڵام دوو کەس زەواج بکەن و

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ٣٦٣.

كەس ئاگادار نەكەن نە وەلی ئەمر و نەشاهێد ئەوە زانایان ڕێیان بەو جۆرە زەواجە نەداوە[١].

د- الزواج بلا ولي: زەواجكردن بە بێ وەلی ئەمر: ئەو جۆرە زەواجە لای زۆربەی زانایان ڕێی پێنەدراوە، چونكە یەكێك لە ئامانجەكانی زەواج پەیوەندی كۆمەڵایەتییە، بەڵام ئەو جۆرە زەواجە بەپێچەوانەوە كێشەی كۆمەڵایەتی دروستدەكات، تەنها لای حەنەفییەكان دروستە، وەلی ئەمر بۆی هەیە ڕازی نەبێت و ئیعتیراز بگرێت، وە ئەگەر ناڕەزاییەكەی لە جێی خۆی بوو حاكم گوێی لێدەگرێت و بەهەند وەردەگیرێت، ئەگەریش لە جێی خۆی نەبوو حاكم گوێی پێنادات.

**ئایا ئەم جۆرە زەواجە دروستە یان نا؟**

وردەكاری زۆری تێدایە، بە چەند خاڵێك ئاماژەی پێدەدەین:

١. گومان لەوەدا نییە كە زەواج بە ڕەزامەندی و ئامادەیی وەلی ئەمر بێت باشترە.

٢. ئایا هەموو جۆرە وەلی ئەمرێك شایەنی ئەوەیە ببێت بە وەلی ئەمر، ئایا دەكرێ بە پرسی ئەو نەبێت زەواج نەكرێت؟

لە ڕاستیدا هەموو وەلی ئەمرێك لەو ئاستەدا نییە كە پێی بگوترێت: وەلی ئەمر و توانای هەبێت زەواجەكە ڕابگرێت، چونكە بێجگە لە باوك جیاوازی زۆرە لەوەی كێ لەپێشترە كە ببێت بە وەلی ئەمر.

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ٤٨٣.

٣. ئایا ناکرێت چاوێك بەمانای وەلی ئەمردا بخشێنینەوە ؟

بۆ نمونە: دایکێك بە فرمێسکی چاو و خوێنی هەناو کچەکەی گەورە دەکات، ئایا ئەو شایەنتر نییە ببێت بە وەلی ئەمر لە جیاتی مامێك کە هیچ زەحمەتێکی بەو کچەوە نەبینیوە؟!

٤. ئەو زەواجەی پێی دەگوترێت: بێ وەلی ئەمر لە مەحکەمەدا جێبەجێ دەکرێت، ئەو کچە زۆربەی کات بە ڕەزامەندی یان بە بەرچاوی باوکی دەڕوات بۆ لای دادوەر، باوکەکەش یان ئەوانیتر کە باوکی نەبوو هیچ ناڕازی بوونێکیان نییە، ئایا ئەو جۆرە زەواجە وەك ئەوە نییە کە وەلی ئەمر ئامادە بێت، مەگەر واتا و مەبەستی وەلی ئەمر نەهاتۆتە دی؟!

٥. لە هەموو عێراق و هەرێمیش بەپێی مەزهەبی ئەبو حەنیفە ژن مارە دەبڕدرێت، دەکرێت ئەوانە هەموو بە ناڕەوا بزانین؟!

٦. ئەگەر بەوە ڕازی نین مەبەستم زانایانی ئایینیە، ئەوا دوو ڕێگامان لەپێشە:

یەکەم: یان دەبێت یاساکە هەموار بکرێتەوە و فشار بکەین.

دووەم: یان دەبێت لە تەنیشت جەنابی دادوەر ژورێك بۆ مامۆستای ئایینی هەبێت بۆئەوەی وەك پەیڕەوی جمهور مارەی بکات.

یان دەبێت لە ناوەندی شار نوسینگەیەك هەبێت بۆ ژن مارەبڕین لای زانای ئایینی و ڕسوماتێك وەربگیرێت و دواتر لە مەحکەمە تصدیق بکرێت.

ذ- الزواج بأهل الكتاب: بەدەقی قورئانی پیرۆز زەواج لەگەڵ ئافرەتانی خاوەن كتاب ڕێگەپێدراوە، بەڵام گرفتە ئەوەیە ئایا ئەوەی ئێستا لە ئەوروپایە بە خاوەن كتاب حیساب دەكرێت؟

گومان لەوەدا نییە كە بەشێكی بەرچاو لە خاوەن كتابەكان دەستبەرداری دینەكەیان بوون بە ئاشكرا حاشای لێدەكەن، واتا بوون بە بێدین، گومانیش لەوەدا نییە كە ئەوانە ناگرێتەوە، خاڵێكی تر داوێن پاكییە، بۆیە دەبێت ئێمە لەم دوو خاڵە وریا بین، وە خاڵێكی تریش هەیە كە ئەویش نەكەینە نەریت لە بەرامبەردا ئافرەتانی مسوڵمان وێڵبكرێن، ئەوكات ئێمە لە پێناو حەڵاڵیدا توشی حەڕام دەبین، وە دەشكرێ بۆ ئەوروپا ئەوەش بڵێین كە زەرورەتێك هەبێت، چونكە لەوێ هاوسەر هیچ دەسەڵاتی بەسەر ماڵ و منداڵیدا نییە، بەڵام لە حاڵەتی ئاساییدا پیاو توانای بەسەر پەروەردە و ئایینی ماڵ و خێزانیدا هەیە.

بۆیە ئەو زەواجەمان باسكرد، چونكە زۆرێك لەوانەی كە لە ئەوروپان گوێ بە مەرجەكان نادەن وا دەزانن بە ڕەهایی دروستە زەواج لەگەڵ ئافرەتانی ئەهلی كیتابدا بكەیت، بەوەش توشی زینا و بێ شەرعی دەبن و ماڵ و منداڵیان لەدەست دەدەن لە داهاتوودا.

ر- الزواج بالزانیات: زەواج لەگەڵ ئافرەتانی زیناكار، زەواج لەگەڵ پیاوانی زیناكار.

خوای پەروەردگار هانمان دەدات زەواج لەگەڵ پاکاندا بکەین: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾ [المائدة: ٥].

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٥﴾ [النساء: ٢٥]، وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٢٦﴾ [النور: ٢٦]، واتە: ئافرەتانی پیس بۆ پیاوانی پیس، پیاوانی پیس بۆ ئافرەتانی پیس ... .

وە دەفەرموێت پیاوی زیناكار تەنها ئافرەتی زیناكار و هاوبەش پەرست مارەدەكات: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٣﴾ [النور: ٣].

❖ (و حرم ذلك على المؤمنين)، ئایا (ذلك) ئاماژەیە بۆ زینا یان نكاح؟

واتا: هەرچۆنێك بێت دەبێت داوێنپاكان خۆیان بپارێزن و زەواج لەگەڵ زیناكاران نەكەن.

بەڵام ئەگەر تۆبەیان كرد ئەوا زۆربەی زانایان بە دروستیان داناوە، وە ئەگەر دوای زیناكردن بەیەكەوە زەواجیان كرد ئەوە هەر دروستە و زۆریش باشە، وەك گوتراوە: (أوله سفاح و آخره نكاح)، مادام ئەو كارە خراپە بە نیكاح كۆتایی هاتووە، باشە.

ز- الزواج بنية الطلاق: هاوسەرگیری كردن بە نیەتی لەیەكجیابوونەوە و تەڵاقدان: ئەو زەواجە ئەوەیە پیاو ژنێك مارە دەكات نیەتی ئەوەیە نەیگرێتە خۆی و دوای ماوەیەك وازی لێبێنێت و تەڵاقی بدات، جا ژنەكە بەو نیەتە بزانێت یان نا: ئەو زەواجە كۆمەڵێك هۆكاری هەن لەوانە:

❖ سەفەركردنی قوتابی و بازرگانەكان و ئەوانەی سەفەری هەندەران دەكەن.

❖ بەشێك لە خەڵكی بۆ دەستخستنی ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتە ئەو كارە دەكەن.

❖ بەهۆی سەفەرکردن بۆ سیاحەت و گەشت و گوزار.

**جیاوازی نێوان ئەو زەواجە (الزواج بنية الطلاق، زەواج بەنیەتی تەڵاقدان- زەواجی کاتی ) لەگەڵ زەواجی موتعە:**

زۆربەی زانایان جیاوازیان نەکردووە لە نێوان زەواجی کاتی و موتعە، بەڵام حەنەفییەکان جیاوازی لە نێوان ئەو سێ زەواجە دەکەن:

١. زەواجی کاتی: ئەوە کە پیاوێك ئافرەتێك مارە دەکات بە شاهێد و مارەیی، بەڵام بۆ کاتێکی دیاری کراو، کەواتە زەواجی کاتی و زەواج بە نیەتی تەڵاق هەردووکیان یەك دەگرنەوە لەوەی کە صیغەی تێدایە و شاهێد و مارەیی و دوو شاهێد ئامادەی دەبن، بەڵام جیاوازی گرینگ لە نێوان ئەو دوو زەواجە ئەوە کە لە زەواج بە نیەتی تەڵاق باسی کاتی تێدا ناکرێت.

٢. جیاوازی نێوان زەواجی موتعە و زەواج بە نیەتی تەڵاق: جیاوازییەکە لەڕووی صیغەوەیە، چونکە زەواجی موتعە بە وشە (لفظ)ی موتعە دەکرێت.

٣. دیاری کردنی کات: لە زەواجی موتعەدا کات دیاری دەکرێت جا دیار بێت یان دیار نەبێت، وەك بڵێین: ١٥ڕۆژ یان تاکو دەڕۆمەوە.

٤. زەواجی موتعە شاهێدی تێدا نییە، بەڵام زەواج بە نیەتی تەڵاق شاهێدی تێدایە.

٥. زەواجی موتعە بە تەواوبوونی كاتەكەی هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام زەواج بە نیەتی تەڵاق هەڵناوەشێتەوە مەگەر بەتەڵاقدان یان خلع یان هەڵوەشاندنەوە (فسخ).

٦. لە زەواجی موتعەدا ئەگەر حەیز نەبینێت عیددەی لەسەر نییە، وە ئەگەر حەیزی بینی دوو حەیزە، وە نەفەقەی تێدا نییە و میرات بردن نییە و نەسەبی پێ دانامەزرێت، بەڵام لە زەواج بە نیەتی تەڵاق هەموو ئەو شتانە هەن.

**حوكمی زەواج بە نیەتی تەڵاق:**

زۆربەی زانایان ئەو زەواجە بە دروست دادەنێن، لەبەرئەوەی ئەو نیەتە بە ئاشكرا لە كاتی مامەڵەی مارەكردن باس ناكرێت، نیەتیش قابیلی گۆڕانە.

لەلای ئیمامی ئەوزاعی ئەو زەواجە بەتاڵە و دانامەزرێت، وە هەركام لەوانە بەڵگەی بۆ بۆچونەكەی خۆی هێناوەتەوە، ئێمە موناقەشەی ئەو بۆچون و بەڵگانە ناكەین، بەڵام ئەوە دەڵێین بەڕاستی كارێكی باش نییە، چونكە ئەگەر ژنەكە بەو كارە بزانێت بێگومان ڕازی نابێت، وە مارەبڕین دەبێت ئەوپەڕی ڕاستی تێدا بێت، هەروەها متمانە لە زەواجدا نامێنێت، دواتر بۆی هەیە منداڵ بخەنەوە ئەوكات گرفتەكە گەورەتر دەبێت.

س-زواج الشغار: ژن بە ژن: بەو زەواجە دەگوترێت یەكێك كچی خۆی یان خوشكی خۆی لە یەكێك مارە بكات بە مەرجێك ئەوی تریش هەمان كار بكات بێ ئەوەی مارەیی لە نێوانیاندا بێت، واتا دەبن بە مارەیی یەكتر،

ئەو شێوازە لە هەر چوار مەزهەبەکەدا ناڕەوایە، ئەوەی کە ڕێگای پێدراوە ئەوەیە کە مارەیی دابنرێت و مەرجەکە هەڵدەوەشێتەوە.

هەتا مامۆستا (مەلا عبدالكريم المدرس) پێی وایە جۆری دووەمیش دەبێت لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕێگری لێبکرێت، چونکە کێشەی کۆمەڵایەتی زۆری لێدەکەوێتەوە.

دیارە زەواجی تریش هەن، بەڵام ئامانج لەو ئاماژە خێرایە ئەوەیە کە بزانین زۆر کارکراوە بۆئەوەی زەواج لە ئامانجی خۆی لابدرێت و بە شێوازی نا شەرعی جێبەجێ بکرێت، مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین ئەو جۆرە زەواجانە بێشەرعین، بەڵام زۆربەشیان بێشەرعین و ئامانجی زەواج ناپێکن.

# بەشی دووەم

## شوێنەوارەکانی تاوانی زینا

- شوێنەواری مرۆیی
- شوێنەواری شارستانی
- شوێنەواری ئیمانی
- شوێنەواری کۆمەڵایەتی
- شوێنەواری ئابوری
- شوێنەواری سیاسی
- شوێنەواری تەندروستی

## شوێنەواری مرۆیی

مرۆڤ ئەو دروستکراوە گەورە و بەڕێزەیە کە خوای گەورە لە جوانترین شێوە دروستی کردووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤﴾ [التين: ٤]، وە ڕێزی لێگرتووە، وەك دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ٧٠﴾ [الإسراء: ٧٠]، فریشتەکان کڕنوشی ڕێزیان بۆ ئادەم برد، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ [البقرة: ٣٤]، وە پێغەمبەرانی بە شەریعەت و بەڵگە و یاساوە بۆ ناردووە، وەکو پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ٢٥﴾ [الحديد: ٢٥]، هەروەها ژیری بە مرۆڤداوە، کە مرۆڤ ژیر نەبێ هیچ شتێکی لەسەر نییە و لە بازنەی تەکلیف پەیوەستکردن بە یاساکان دەچێتە دەرەوە، هەروەها ئاسمانەکان و زەوی بۆ ڕامکرد، وەك دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١٣﴾ [الجاثية: ١٣]، وە خستیە ناو قاعەی

تاقیکردنەوە و هەموو ماددە پێویستەکانی ئەو تاقیکردنەوەیەی پێدا، وە پرسیارەکانی بە تەواوی بۆ شیکردەوە و بیانو و حوجەی بەدەستەوە نەهێشت، خۆ ئەگەر کەسێك بیانوی هەبێت خوای گەورە سزای نادات، وە پەروەردگار مزگێنی و مژدەی سەرکەوتنی پێدا لە دونیا و دوا ڕۆژ، وەك دەفەرمویێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴿٩٧﴾﴾ [النحل: ٩٧]. وە بەڵێنی بەمرۆڤدا کە هەرکات هەڵەیان کرد و داوای لێخۆشبوون و لێبوردنیان کرد لێیان خۆشدەبێت، وە چاکەکانیان لە یەك بە دە و یەك بە حەوت سەد و یەك بە هەزاران حیساب دەکات، وە لە هەرشتێك زیاتر گرینگی بەمرۆڤ دراوە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا ڕوندەبێتەوە، وە ئەو مرۆڤە کۆمەڵێك غەریزەی تێدا دروستکراوە بۆئەوەی ژیانی بەردەوامبێت، لە ناو ئەو غەریزانەدا غەریزەی ئارەزوو (الشهوة)، ئەگەر ئارەزووی جوتبوون لە مرۆڤ و زیندەوەراندا نەبێت ئەوا ژیان بەردەوام نابێت، بەوەی کە مرۆڤ خاوەنی ئارەزووە هیچ نەنگییەکی تێدا نییە، بەڵام کە نەتوانێ لە جێگەی خۆیدا دایبنێت و ئاژەڵانە هەڵس و کەوت بکات ئەوە جێگای نەنگی و گلەیی و دەرچوونە لە یاسا و ڕێسای مرۆڤ بوون، وە کارەسات بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هەر بۆیە ماددیەت تەواو فەشەل و دەستەوەستانە بۆ دابینکردنی ژیانێك کە شایەن بە مرۆڤ بێت بەتایبەت لەلایەنی جێبەجێکردنی ئارەزوەکانی و دەستەبەرکردنی ئارامی و ئاسودەیی بۆ مرۆڤ، وە کاروانی مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێرێکی بێ

ئەمان و ئاسایش بردووە، خودی ئەو ئارەزووە کە پێویستە بۆ مرۆڤ خەریکە هەڕەشە لە مرۆڤ دەکات.

## شوێنەواری شارستانی

شارستانی بەرهەمی ڕەنج و تێکۆشانی بەردەوامی مرۆڤایەتییە لە هەموو بوارەکانی ژیان، وە هەر ئایدیا و میللەتێك جۆرێك لە جوهد و ماندوبوونی پێشکەشکردووە و وای کردووە کە چەندین تایبەتمەندیەکی شارستانی خۆی هەبێت، وە پێوەری ماددی بۆ لێکدانەوەی شارستانی جیاوازە لە پێوەری کەسێکی بڕوادار.

وە دەتوانین بڵێین ئەگەر شارستانیەتی:

- یۆنانی تەقدیسی فەلسەفە و ژیری تێکراوە.
- شارستانیەتی ڕۆمانی و فارسی تەقدیس و بەگەورەگرتنی هێز و دەسەڵاتدارەکانی تێکراوە.
- وە شارستانیەتی هیند و صین و دینە شەرقییەکان تەقدیسی ڕوح و دونیای ڕوحانیەتی تێدا تەقدیس کراوە.
- وە بەلای جولەکەوە شارستانیەتی ڕاستەقینە تەنها ئەوان خاوەنداریەتی دەکەن، چونکە گەلی هەڵبژاردەی خوان.
- وە شارستانیەتی ئەوروپی لە ئێستادا هەرچەند لە زۆر لاوە پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە، بەڵام لە کۆتاییدا مرۆڤی تەواو و پلەیەك کەسی سەرزەرد و سور و سپی پێستە، خۆیان بە حاکمی دونیا دەزانن، پێیان وایە دەبێت بڕیاردەر لەسەر زەوی ئەوان بن و دەبێت مرۆڤایەتی بە جۆرێك لە جۆرەکان کۆیلەی ئەوان بن.

❖ شارستانی ئیسلامی هیچ شتێکی باشی تێدا فەرامۆش نەکراوە.

ڕاستە لە ئێستادا جیهانی ئیسلامی شپرزە و پارچە پارچەیە، بەڵام خاوەنی گەورەترین سامانی مرۆیی و دین و مێژوو و سەروەرییە و داهێنانی جۆراوجۆری لەسەر زەویدا کردووە، هەر بۆیەش هەموو مرۆڤایەتی بە بێ جیاوازی باوەشی بۆ کردووەتەوە.

یەکێك لەو بوارانەی کە شەریعەت زۆر بە تەواوی یاسا و ڕێسای بۆ داناوە بواری خێزانداری و دروستکردنی ژیانی کۆمەڵایەتییە.

لەسەر زەویدا هیچ قانون و یاسایەك نییە ئەوەندەی ئیسلام گرینگی بە لایەنی ئەو دوو ڕەگەزە دابێت و زەمانی دانابێت بۆ پاراستن و هێشتنەوەی خێزان بە تەندروستی.

یەکێك لەو تاوانانەی کە هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات و سیمای شارستانیەتەکانی ناشیرین کردووە و بەرەو لە ناوچوون و داڕمانیان دەبات ئەو لادانە جنسیانەن بە هەموو جۆرەکانیەوە.

لەوانەش زینا و نێربازی و مارەبڕینی مەحرەم و زەواج لەگەڵ ئالەت و ئاژەڵ ...هتد.

(سوالد شینفلر)ی ئەڵمانی دەڵێت: ڕەگەزی مرۆڤ ڕووی لە تیاچوون و هەڵدێرە، وە داڕمانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بێگومان داڕمانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بە دوا خۆیدا دەهێنێت.

(جیمس رستون) لە نیۆرك تایمز دەنوسێت: مەترسی داڕمانی هێزی جنسی مەترسیدارترە لە مەترسی بۆمبی ئەتۆمی[١].

لە ١٩٦٤ لە سوید هەرا و دەنگۆیەکی گەورە پەیدابوو کە ١٤٠ دکتۆر داوایان لە پەرلەمان و حکومەت کرد کە سنورێك بۆ ئەو فەوزا و بەرهەڵاییە جنسیە دابنێن.

لە ١٩٦٢ کەنەدی سەرۆکی ئەمەریکا ڕایگەیاند کە ئایندەی ئەمەریکا بەرەو ئاقارێکی مەترسیدا دەڕوات[٢].

جۆرج بۆش لە کتێبێك بە ناوی (شۆڕشی جنسی): چەندین تەن لە بۆمبی جنسی دەتەقێتەوە ڕۆژانە شوێنەوارەکەی نەك تەنها منداڵەکانمان دەکات بە دڕندە لە ڕووی ڕەوشتەوە بەڵکو هەموو کۆمەڵگا دەشێوێنێت.

---

١- الفقه و منهج الاستحقاق: يحيى سليمان، ص ١٨.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# شوێنەواری ئەخلاق و ڕەوشت

شوێنەواری لادانی جنسی بە گشتی و زینا بە تایبەتی کاریگەرییەکەی لەسەر تاك ناوەستێت، بەڵکو دەپەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگا هەر لە جیابوونەوەی هاوسەران و بزربوونی منداڵ و هەڵوەشانەوەی خێزان و نەمانی متمانە لە نێوان هاوڕێ و شەریك و هاوبەشی کار.

پەیدابوونی چەندین جۆری تاوان و نەمانی متمانە و هەموو جۆرە دەستدرێژییەکان لە ناویشیاندا دەستدرێژی جنسی، وە ئەمەش چەندین بەڵاو کارەساتی لێدەکەوێتەوە لەوانە:

١. پەیدابوونی نەریتی ناشیرینی ئەخلاقی، وەك: هاوڕەگەزبازی کە نێر نێر مارەدەکات و مێ مێ مارەدەکات، زینا لەگەڵ مەحرەم، و زەواج لەگەڵ ئاژەڵ و ئامێر ...هتد.

٢. پێگەیشتنی ناوەختی منداڵ لە ڕووی جنسییەوە کە بێگومان زیانی زۆر بە تەندروستی منداڵ و گەنج دەگەیەنێت.

٣. وای لێهاتووە دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر منداڵان لە تەمەنی ٧ساڵی و ٨ ساڵیدا بووەتە باو، ڕۆژانە لەم جۆرە سکاڵایانە بەرزدەکرێنەوە بۆ دادگا.

ناوەندێکی تەندروستی بە ناوی (UCHS) لە ئەمریکا دەریخستووە کە ٤٩٪ ئافرەتان تەمەنیان لە ١٩ ساڵ کەمترە کە توشی حاڵەتی زینا دەبن.

یەكێك لەو شوێنەوارە خراپانە پشتكردنە لە زەواج، لەوەش خراپتر دروستكردنی كۆمەڵە و ڕێكخراو بۆ ڕابواردن لەگەڵ منداڵان لە تەمەنی ٧ ساڵی و ٨ ساڵی وەك ڕێكخراوی (رین جیون).

هەروەها تاوانی دەستدرێژی سێكسی بە ئەندازەیەك بەرزبووەتەوە لە وڵاتێكی وەكو ئەمریكادا زیاتر لە سەدان حاڵەتی دەستدرێژی سێكسی بڵاودەبێتەوە.

- لەوەش خراپتر بازرگانی كردن بە جنس.
- لەوەش خراپتر فرۆشتن و ڕفاندنی ئافرەت و منداڵ لە ڕێی باندە ترسناكەكانەوە.
- هەروەها پەیدابوونی ناوەندی میدیای زۆر بۆ لادانی جنسی و هەڵتەكاندنی خێزان.
- بڵاوبوونەوەی ئەو هەموو منداڵە ناشەرعیانە، كە ئەمەش كارەسات دروستدەكات هەم لە ڕووی ئابورییەوە هەم لە ڕووی پەروەردەییەوە.
- یەكێكی تر لە شوێنەوارە خراپەكان ڕاكردنی ئافرەت لە ڕۆڵی دایكایەتی.

## شوێنەواری دەروونی تاوانی زینا

عبداللەی كوڕی عباس ڕەزای خوا لە خۆیی و باوكی بێت دەفەرموێت: (تاوان دەم و چاو ڕەش و ئاڵۆز دەكات، دڵ تاریك دەكات، لاشە بێهێز دەكات، ڕزق و ڕۆزی كەم دەكات، لە دڵی خەڵكدا ناخۆشەویست و بوغزێندراوت دەكات)[1].

مرۆڤ پێكدێت لە ڕوح و لاشە و كۆمەڵێك غەریزەی ڕێك و پێك و پێویست بۆ بەردەوام بوونی لە ژیان، هەر كاتێك گرینگی بە لایەنێكدا لەسەر حیسابی لایەنەكانی تر، هاوسەنگی لە ژیانی مرۆڤدا نامێنێت، كە بەختەوەری مرۆڤ لەو هاوسەنگییەدایە، هەر بۆیە مرۆڤ كە زیاد لە پێویست گرینگیدا بە لایەنی جنسی توشی لادانی مەترسیدار دەبێت، هەروەك ئاماژەمان بە هەندێك بوار كرد، وە ئەو بوارانەی كە مرۆڤ تێیدا باجی گەورە دەدات لایەنی دەروونییە، لەوانەش:

١. مرۆڤ توشی دوودڵی و دڵەڕاوكێ دەبێت و ئارامی و ئۆخژن بە خۆیەوە نابینێت، وە ئەم حاڵەتە تاك بێهیوا دەكات و وا دەكات بیر لە خۆكوشتن بكاتەوە، بۆیە ڕاپۆرتەكان ئاماژە بەوە دەكەن كە هەر دوو سەعات یەكێك

---

١- الجواب الكافي: ابن القيم الجوزية.

دەیەوێ خۆی بکوژێت لە بەریتانیا، کە ئەمە زەنگێکی مەترسیدارە بۆ سەر کۆمەڵگا[١].

٢. نەمانی هەست و نەست و غیرەت و پیاوەتی، هەتا وای لێدێت غیرەت و پیاوەتی و ناموس لە فەرهەنگی ئەو کۆمەڵگایانەدا خەریکە ڕەش دەبێتەوە.

٣. گرفتی خێزانی و نەمانی متمانە لە نێوان هاوسەراندا، گۆڤاری (التایم)ی ئەمریکی دەڵێت: شەش ملیۆن ژن ساڵانە لە لایەن مێردەکانیانەوە توشی لێدان دەبن.

٤. نەمانی هەستی باوکایەتی و دایکایەتی و کوڕ و کچیەتی و خزمایەتی لە نێوان تاکەکانی خێزان، سەیرکردنی فیلمە ئیباحییەکان زۆرترین کاریگەریان هەیە لەسەر زیادبوونی تاوان و تێکچوونی دەرونی.

ئیبن قەییمی ئەلجەوزی دەفەرموێت:

زینا هەموو خەسڵەت و تایبەتمەندیە خراپەکان کۆدەکاتەوە لە:

١. کەمی دین و دینداری.

٢. نەمانی خۆپارێزی.

٣. تێکچونی پیاوەتی و غیرەت.

---

١- الغفة: ل ٢٦.

٤. زیناکارێك نابینی بەڵێنەکانی بباتەسەر، ڕاست بکات لە وتەکانی، پارێزگاری لە هاوڕێگرتن بکات، لەبەرامبەر ماڵ و منداڵەکانی غیرەتی هەبێت.
٥. پەیمان شکاندن.
٦. درۆکردن.
٧. خیانەت.
٨. کەم شەرمی.
٩. هەستنەکردن بە چاودێری و موراقەبەی خوا.
١٠. نەگەڕانەوە و شەرم نەکردن لە حەرام.
١١. نەمانی غیرەت و هۆکاری غیرەتی لە دڵ و ڕەوشتیدا[١].

گۆڤاری تایمزی ئەمریکی دەڵێت: ساڵانە ٦ ملیۆن ئافرەت لەلایەن هاوسەرەکانیانەوە تۆشی لێدان دەبن.

لە لێکۆڵینەوەیەکی وەزارەتی دادی ئەمریکیدا هاتووە کە ئەو گەڕەکانەی بەرهەڵایی جنسیان تێدا باوە تاوان تێیدا بەڕێژەی ٥٠٠٪ بڵاودەبێتەوە.

---

١- روضة المحبين، طبعة مكتبة منافع، ص٣٦٠.

## شوێنەواری تەندروستی تاوانی زینا

من بۆ ئەو بابەتە سود وەردەگرم لەو بابەتەی کە دکتۆر عبدالله العاوي لە ئینتەرنێت بڵاویکردۆتەوە کە دواتر ناوی سایتەکە دەنوسم، دیارە ئەو بابەتە زۆری لەسەر نوسراوە بەڵام من بە پوختی نوسینەکەی ئەو بەکاردێنم کە ئەو دکتۆرە و بابەتەکە پسپۆڕی خۆیەتی.

نەخۆشیە جنسییەکان لەمرۆدا بە ترسناکترین پەتا دەژمێردرێن، کە هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکەن، لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە نەخۆشیە جنسیەکان مەترسیدارترینی ئەو نەخۆشیانەن کە لە جیهاندا بەشێوەیەکی ترسناك تەشەنە دەکەن بەگشتی و لە خۆرئاوا بە شێوەیەکی خێراتر و بەرچاو ژمارەی توشبووان بەرزدەبێتەوە.

دکتۆر (جولد) دەڵێت: لە چرکەیەکدا چوار کەس توشدەبن بەو نەخۆشیە.

دکتۆر (جورج کوس) دەڵێتط ئەو حاڵەتانەی کە ڕادەگەیەندرێت یەك لەسەر چوار جاری وایە یەك لەسەر دەی ئەوەیە کە ڕادەگەیەندرێت.

دکتۆر (جولد) دەڵێت: لێکۆڵینەوەکان لە بەریتانیا دەریانخستووە لە ماوەی ٣٠ ساڵی ڕابردوودا کە هەڵگری یەکێك لەو ڤایرۆسانە بۆی هەیە بگوازرێتەوە بۆ ١٦٣٩ کەس، ئەی دەڵێی چی کە هەڵگرانی ئەو ڤایرۆسانە بە دەیان و سەدان و هەزاران بن، دکتۆر دەڵێت: هەر بۆیە چەندین ڕێکخراوی جیهانی وەك ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و یەکیەتی ئەوروپا بۆ

ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشییەكان چەندین ڕێنمایی و بڕیاریان دەركردووە، بەڵام لە كۆتاییدا فەشەلی هێناوە و بێ ئاكام بووە.

دەربارەی شوێنەواری خراپی زینا دەڵێت:

ئەوەی كە پێغەمبەری خوا بەڵێنی داوە ﷺ دەربارەی مەترسی زینا و لادانی جنسی هەمووی هاتۆتە دی كە فەرموویەتی: (لم تظهر الفاحشة في قوم قطُّ حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن في أسلافهم الذين مضوا)[١].

داوێن پیسی لە ناو هەر قەومێكدا بڵاوببێتەوە و بەئاشكرا ئەنجامی بدەن، بەو هۆیەوە چەندین نەخۆشی و پەتا لە ناویاندا بڵاودەبێتەوە كە لە گەلانی پێشخۆیاندا هەرگیز شتی وا نەبووە.

بۆیە دەبینین زینا و نێربازی وا بڵاوبووەتەوە شانازی پێوەدەكەن كە وای لێهاتووە داوێنپاكی بووەتە شەرمەزاری و عەیبە، سەیرە ئافرەتێك هەبێت كە زینای نەكردبێت بەبێ هاوسەری یان كوڕێك مەبەستم پێش تەمەنی یاسایی و دوای تەمەنی یاساییش، بۆیە هەر بەمنداڵی فێری ڕێگریكردن لە منداڵبوونیان دەكەن.

بەپێی ڕاپۆرتی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی لە ساڵی ١٩٨٣ تەنها لە ئەمریكا یەك ملیۆن منداڵ بە سەرپەرشتی دایكیان دەژین و باوكیان ناناسن.

---

١- صحيح الجامع: ٧٩٧٨.

بە پێی ڕاپۆرتە تازەکان تەنها لە ئەمریکا زیاتر لە حەوت ملیۆن خێزان ئافرەت بەڕێوەی دەبات بە بێ پیاو.

ئەو منداڵانەی کە لە باردەبردرێن ساڵانە ژمارەیان بۆ پەنجا ملیۆن بەرز دەبێتەوە.

(دائرة المعار البريطانية) دەڵێت: ئەوانەی توشی لادانی جنسی بوون لە بازنەی نهێنی دەرچوون ئێستا نادی و مەلەوانگە و شوێنی تایبەتیان هەیە، تەنانەت وای لێهاتووە ٪٦٠ ئەوانەی لە کەنیسەن توشی لادانی جنسی بوون.

ساڵانە نەخۆشی (سیلان) ڕژان بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاودەبێتەوە، ئەوانەی توش دەبن زیاترن لە ٢٥٠ ملیۆن کەسن کە ئەو نەخۆشیە کاریگەری بۆ سەر هەموو لاشەی مرۆڤ هەیە و توشی هەوکردن و چەندین ئازاری بەهێزی دەکات لە هەمووشی خراپتر نەزۆکی.

## شوێنەواری لادانی جنسی

گومان لەوەدا نییە كە هەركاتێك لادانی جنسی تەشەنەی سەند لە هەر كۆمەڵگایەكدا چەندین شوێنەواری خراپی لێدەكەوێتەوە، دیارە شوێنەوارەكان لەزۆر بواردا جێدەمێنن، بەڵام ئێمە دەكرێ تەنیا ئاماژە بە چوار بوار بكەین:

- ✓ بواری ژیاری
- ✓ بواری تەندروستی
- ✓ بواری تاوانكاری
- ✓ بواری ئابووری

**بواری ژیاری (الحضاري):**

هەر كاتێك تاكی كۆمەڵگا بەرەو داڕوخان ڕۆیشت حەتمەن خێزان بەدوایدا و دواتریش كۆمەڵگا بەرەو داڕمان دەچێت، چونكە شارستانی بریتییە لەهەموو ئەو دەسكەوت و ئینجازانەی كە مرۆڤ لە بوارە جیا جیاكان وە دەستی هێناوە.

داڕمانی ئەخلاقی گرفتی زۆر بۆ وڵاتان و كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دروستكردووە، وە زانایان لە هەموو توێژەكانی كۆمەڵگا هەست بەو مەترسیە دەكەن، بۆیە هەر زوو زەنگی مەترسی لەم بارەیەوە لەلایەن دڵسۆزانەوە بە گوێیاندا دەدرێت.

**لەو دڵسۆزانە:**

- ئیسواد شینملری ئەڵمانی: دەڵێت مرۆڤایەتی بەرەو داڕمانە لە داهاتووی نزیکدا، داڕمانی شارستانی بێگومان بەدوای خۆیدا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕادەکێشێت تا وای لێدێت کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا لەدایکبوونێکی تر بەخۆیەوە نابینێت[١].
- جیمس دستون دەڵێ: مەترسی وزەی جنسی زیاترە لە مەترسی وزەی نەوەوی.
- لە ساڵی ١٩٦٤ دەنگدانەوەیەکی گەورە لە سوید پەیدابوو بەهۆی ئەوەی کە ١٤٠ پزیشك لە پزیشکە بەناوبانگەکان داوایەکیان پێشکەشی سەرۆك و پەرلەمان کرد، بۆئەوەی سنورێك بۆ ئەو بەرهەڵایە ئەخلاقییە دابنێن.
- کەنەدی سەرۆکی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦٢ گوتویەتی: داهاتوی ئەمریکا لە مەترسیدایە لەبەرئەوەی گەنجەکانمان بەزایەچوون و ونبوون و ڕۆچوون لە ئارەزووبازیدا، ناتوانن ئەوبەرپرسیاریەتە لە ئەستۆ بگرن کە دەکەوێتە سەرشانیان، وە لە هەر ٦ سەرباز یەکێکیان بە کەڵکی سەربازی نایەت[٢].
- جورج بوش لە کتێبەکەی بەناوی (الثورة الجنسية) دەڵێت: هەموو ڕۆژێك چەندین تەن قومبەلەی جنسی دەتەقێتەوە، شوێنەوارەکانی زۆر

---

١- الفقه و منهج الاستحقاق: يحيى سليمان العقيلي، مؤسسة شروق، ص ١٨.

٢- سەرچاوەی پێشوو: ل ١٨.

جێی دڵەڕاوکێن، وە بەتەنیا منداڵەکانمان نابنە دڕندەیەکی ئەخلاقی، بەڵکو هەموو کۆمەڵگا دەشێوێنێت.

گومان لەوەدا نییە کە ئەوەی شارستانی بنیات دەنێت مرۆڤە، وە ئەگەر مرۆڤەکە داڕما چاوەڕوانی چ جۆرە شارستانییەك دەکرێت؟!

## شوێنەواری کۆمەڵایەتی

یەکێك لە شوێنەوارە خراپەکانی بەدڕەوشتی لایەنی کۆمەڵایەتییە، وە شوێنەوارە خراپەکانی تەنیا بۆ سەر تاك نییە بەڵکو بۆ سەر هەموو کۆمەڵگایە. شوێنەوارەکانیشی جۆراوجۆرن، لەوانە:

١. دەرکەوتنی نەریتە خراپەکان لە بواری جنسی، وەك زەواجی هاوڕەگەزی ژن لەگەڵ ژن، پیاو لەگەڵ پیاو، مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ، خوی نهێنی، خۆ ساردکرنەوە بەهۆی ئامرازە دەستکردەکان.

٢. پێگەیشتنی ناوەخت بۆ منداڵان، یەکێك لە دادوەرەکانی ئەمریکا دەڵێت: منداڵەکان پێش تەمەنی خۆیان دەبن بە هەرزەکار، لە تەمەنی زۆر زوودا لایەنی جنسیان پێدەگات، لە ڕاپۆرتێکی پزیشکی شاری (بالتیمور)دا هاتووە هەزار سکاڵا بەرزکراوەتەوە کە منداڵانێك توشی کاری سێکسی بوون کە تەمەنیان دوازدە ساڵانە و لەو تەمەنەش کەمترن[١].

٣. یەکێکیتر لە شوێنەوارە خراپەکان پشتکردنە لە زەواج، لە ڕاپرسییەکدا هاتووە لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٨٥ لە سەدا نەوەدی خەڵکی پێیان ئاسابیە پێکهاتنی هەردوو ڕەگەز بە بێ زەواجی شەرعی، وە لە سەدا دە پێی وایە پێکهاتنی ئەو دوو ڕەگەزە دەبێت بە پێی وەسیقەی زەواج بێت، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەو لە سەدا دەیە توشی زینا نابێت.

---

١- الفقه و منهج الاستحقاق: ل ١٩.

٤. یەکێکی تر لەو شوێنەوارە خراپانە مومارەسەی بەدڕەوشتی بە کۆمەڵ، وەك ئاهەنگی ڕوت و قوت و ڕەقس و گۆرانی لەسەر میدیا و شوێنە گشتییەکان، وە بوونی سۆزانیەکان لە کۆڵان و بازاڕەکان و شوێنی لەش فرۆشی ... هتد.

٥. دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتان و منداڵان وای لێدێ کەس دڵنیا نابێت لە منداڵەکانی خۆی بیاننێرێت بۆ باخچەی ساوایان و خوێندنگاکان.

٦. پەیدابوونی چەندین باندی مەترسیدار بۆ ڕفاندنی ئافرەتان و منداڵان و بازرگانی پێوەکردنیان، ساڵانە هەزاران منداڵ دەبنە قوربانی.

٧. دەستدرێژی سێکسی لەلایەن کەسە نزیکەکانەوە وەك باوك و برا و مەحرەمەکان.

٨. دروستکردنی کۆمەڵە و باندی تایبەت بۆ پەرەدان و جوانکردنی زەواج لەگەڵ منداڵان وەك کۆمەڵەی (ڕین جیون) کە دروشمی ئەوە بەرزدەکاتەوە دەڵێت: سێکس لەگەڵ تەمەنی هەشت ساڵی بەرلەوەی لە دەست دەربچێت.

٩. تاوانی دەستدرێژی سێکسی هەتا وای لێهاتووە لە ئەمریکا لە هەر حەوت دەقەدا دەستدرێژی سێکسی ڕوودەدات، واتا لە ڕۆژێکدا ١٠٣ کەس دەبن بە قوربانی ئەو حاڵەتە.

١٠. میدیاش بووەتە هۆکاری برەودان بە تاوانی زینا بەبێ سنور و سانسۆر لە دوای مادده هۆشبەرەکان بووەتە خێراترین هۆکار بۆ تاوانی دەستدرێژی ڕێکخراو.

١١. کەوتنەوەی ئەو هەموو منداڵە بێشەرعییە و بێ هەویە، کە دەبێتە بارگرانییەکی زۆر بۆ دەوڵەت هەم لە ڕووی ئابووری و هەم لە ڕووی کۆمەلایەتی و هەم لە ڕووی تەندروستی.

١٢. لەباربردنی ملیۆنان منداڵ ساڵانە، کە ئەمە گەورەترین هەڕەشەیە بۆ سەر مافەکانی منداڵ، ئەوەی لە باریش نەبردرابێت فڕێدەدرێتە ناو حاویە و کۆڵان و بەر دەرگای کڵێسا و مزگەوتەکان.

هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩﴾ [النور: ١٩].

١٣. هەڵوەشانەوەی خێزان بەمانای وشە، کە بۆخۆی خێزان لەو وڵاتانە کەمە و هەر دروست ناکرێت، بەڵام ئەوەی کە هەشە لە ژێر مەترسی هەڵوەشانەوەدایە.

١٤. زۆر بوونی خیانەتی هاوسەری کە ئەمە هەموو سنورێکی تێپەڕاندووە.

١٥. حاڵەتی خەمۆکی هەستکردن بە تەنیایی، کە ئەمە زۆربەی تاکەکانی لە ئەوروپا گرتووەتەوە.

## شوێنەوارە تەندروستییەكانی تاوانی زینا

نەخۆشیە سێكسییە گوازراوەكان ئەو نەخۆشیانەن كە بەهۆی بەیەكگەیشتنی جنسی دەگوازرێنەوە[١].

كێن ئەوانەی كە بەزۆری توشی نەخۆشیە جنسیەكان دەبن؟

١. ئەوانەی كە زینا دەكەن.

٢. ئەوانەی كە سەردانی ئەو شوێنانە دەكەن.

٣. ئەوانەی هاوڕەگەزی دەكەن.

٤. ئەوانەی مادده هۆشبەر و سڕكەرەكان بەكاردەهێنن لەڕێی دەرزییەوە.

٥. كاركەرە بیانیەكان ئەوانەی كە هاوسەریان لەگەڵدا نییە.

٦. ئەو خاوەن پیشانەی كە زۆر دەگەڕێن وەك بازرگانە دەریاییەكان.

٧. ئەوانەی كە زۆر پەیوەندی جنسیان دەگۆڕن[٢].

---

١- الأمراض المنقولة جنسيا: د. عبدالرحيم عبدالله، دار الشروق، ط١، ٢٠٠٩، ص ١٣.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧ - ٣٨.

ئەگەر بە نموونە خشتەیەك وەربگرین بۆ توشبووانی نەخۆشی ئایدز لە ساڵی ٢٠١٦ دەبینین کە چ کارەساتێکی ناوەتەوە:

| ژ | دەوڵەت | ژمارەوە توشبووان | ساڵ |
|---|---|---|---|
| ١ | سویزلاند | ٢٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢ | لیسوتو | ٣٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣ | بوتسوانا | ٣٦٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤ | باشوری ئەفریقا | ٧,١٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥ | زیمبابۆی | ١,٣٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦ | زامبیا | ١،٢٠٠،٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧ | موزنیق | ١,٨٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨ | مالاوی | ١,٠٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٩ | ئۆگەندا | ١,٤٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٠ | غینیا الاستوائیة | ٣٥,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١١ | کینیا | ١,٦٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٢ | تەنزانیا | ١,٤٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٣ | کۆماری ئەفریقای ناوەڕاست | ١٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٤ | کامیرۆن | ٥٦٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | گابۆن | ٤٨,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٦ | بەهاما | ٨,٢٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٧ | ڕواندا | ٢٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٨ | كۆماری كۆنگۆ | ٩١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ١٩ | كینیا بیساو | ٣٦,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٠ | نیجیریا | ٣,٢٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢١ | ساحل العاج | ٤٦٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٢ | باشوری سودان | ٢٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٣ | هایتی | ١٥٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٤ | تۆگۆ | ١٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٥ | ئەنگۆلا | ٢٨٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٦ | بلیز | ٤,٣٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٧ | سیرالیون | ٦٧,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٨ | گامبیا | ٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٢٩ | جامایكا | ٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٠ | لیبیریا | ٤٣,٠٠٠ | ٢٠١٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١ | غیانا | ٨,٥٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٢ | غانا | ٢٩٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٣ | سورینام | ٤,٩٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٤ | باربادوس | ٢,٦٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٥ | جیوبوتی | ٨,٦٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٦ | تشاد | ١١٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٧ | تایلەند | ٤٥٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٨ | ئەثیوپیا | ٧١٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٣٩ | بوروندی | ٨٤,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٠ | ینین | ٦٧,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤١ | مالی | ١١٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٢ | كۆماری دۆمانیكا | ٦٧,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٣ | ئۆكرانیا | ٢٤٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٤ | الرأس الأخضر | ٢,٨٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٥ | پەنەما | ٢١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٦ | بۆرما | ٢٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٧ | لاتفیا | ٦,٦٠٠ | ٢٠١٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٨ | کۆماری کۆنگۆی دیموکراٹ | ٣٧٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٤٩ | بورکینا قاسو | ٩٥,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٠ | کەمبۆدیا | ٧١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥١ | فەنزوێلا | ١٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٢ |ماڵدیف | ١٥,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٣ | ئریتریا | ١٥,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٤ | سفادۆر | ٢٤,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٥ | ئۆرۆگوای | ١٢,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٦ | بەڕازیل | ٨٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٧ | جۆرجیا | ١٢,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٨ | مۆریتانیا | ١١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٥٩ | چیلی | ٦١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٠ | گواتیمالا | ٤٦,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦١ | پاڕاگوای | ١٩,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٢ | نەیجر | ٤٨,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٣ | مالیزیا | ٩٧,٠٠٠ | ٢٠١٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | ئەندەنوسیا | ٦٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٥ | هیندۆراس | ٢١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٦ | كەنەدا | ١٨٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٧ | كوبا | ٢٥,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٨ | كۆستاریكا | ١٣,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٦٩ | كۆلۆمبیا | ١٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٠ | ڤیێتنام | ٢٥٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧١ | ئەرجەنتین | ١٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٢ | بیلا روسیا | ١٩,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٣ | صومال | دیار نییە | ٢٠١٦ |
| ٧٤ | سەنیگال | ٤١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٥ | هیند | ٢,١٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٦ | ئیكوادۆر | ٣٣,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٧ | پۆلیڤیا | ١٩,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٨ | تاجیكستان | ١٤,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٧٩ | پیرۆ | ٧٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٠ | ئیتاڵیا | ١٣٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨١ | لاوس | ١١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٢ | مەکسیك | ٢٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٣ | ئەرمینیا | ٣,٣٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٤ | ئیرلەندا | ٦,٢٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٥ | کازاخستان | ٢٦,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٦ | قیرغزستان | ٨,٥٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٧ | لیتوانیا | ٢,٩٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٨ | مدعثقر | ٣١,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٨٩ | نیپاڵ | ٣٢,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٩٠ | هۆڵندا | ٢٣,٠٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٩١ | نیکاراکدا | ٨,٩٠٠ | ٢٠١٦ |
| ٩٢ | سودان | ٥٦,٠٠٠ | - |
| ٩٣ | سوید | ١١,٠٠٠ | - |
| ٩٤ | ئەلبانیا | ١,٧٠٠ | - |
| ٩٥ | ئوستورالیا | ٢٥,٠٠٠ | - |
| ٩٦ | فیجی | دیار نییە | - |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٧ | طایوان | ٣١,٦٢٠ | - |
| ٩٨ | ئازەربایجان | ٩,٢٠٠ | - |
| ٩٩ | ئێران | ٦٦,٠٠٠ | - |
| ١٠٠ | ڕۆمانیا | ٦٦,٠٠٠ | - |
| ١٠١ | شاخی ڕەش | دیار نییە | - |
| ١٠٢ | مەغریب | ٢٢,٠٠٠ | - |
| ١٠٣ | پاکستان | ١٣٠,٠٠٠ | - |
| ١٠٤ | ماڵتا | دیار نییە | - |
| ١٠٥ | فلیپین | ٢٤,٩٣٦ | - |
| ١٠٦ | جەزائیر | ١٣,٠٠٠ | - |
| ١٠٧ | بەنگلادش | ١٢,٠٠٠ | - |
| ١٠٨ | میسر | ١١,٠٠٠ | - |
| ١٠٩ | یەمەن | ٩,٩٠٠ | - |
| ١١٠ | سعودیە | ٨,٢٠٠ | - |
| ١١١ | ئەفغانستان | ٧,٥٠٠ | - |
| ١١٢ | سریلانکا | ٤٠٠٠ | - |
| ١١٣ | بلغاریا | ٣,٥٠٠ | - |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | کۆماری چیك | ٣,٤٠٠ | - |
| ١١٥ | تونس | ٢,٩٠٠ | - |
| ١١٦ | صربيا | ٢,٧٠٠ | - |
| ١١٧ | لوبنان | ٢,٢٠٠ | - |
| ١١٨ | کرواتیا | ١,٥٠٠ | - |
| ١١٩ | بۆسنە و هەرسك | ٣٥٠ | - |

دیارە نەخۆشی ئایدز واتا نەمانی بەرگری لەش کە کەسەکە بەرگری نامێنێت و بەرگەی کەمترین نەخۆشی ناگرێت.

## نەخۆشی (هربس)

نەخۆشی الهربس یان نەخۆشی (HSV) بریتییە لە: قڵیشان و هەوکردن کە توشی دەم و لوت و ئەندامی زاوزێ دەبێت، وە بۆی هەیە لە هەر شوێنێکی لاشە دەربکەوێت، نەخۆشییەکی بەئازارە و شێوەیەکی ناشیرینی هەیە، لە هەمان کاتدا بۆی هەیە لە هەر کاتێکدا دووبارە ببێتەوە. جۆرەها توشبوون بە هربس هەیە:

١. هربسی لێوەکان و دەوروبەری.

٢. هربسی گلێنەی چاوەکان.

٣. هربسی دەماغ.

٤. هربسی ئەندامی زاوزێ.

٥. هربسی کۆرپەلە و تازە لەدایکبووەکان.

٦. پەیوەندی هربس بە شێرپەنجەی منداڵانەوە.

٧. هربسی ئەوانەی بەرگریان لاوازە[١].

ژمارەی توشبووان بە (هربس) واتا ژەهر، وادادەندرێت کە ٦٧٪ جیهان توشی جۆری یەکەم بووبێت (HSV ١)، وا دەخەمڵێندرێت کە ٤٩١ کەس توشی هربسی جۆری دوو بووبێت.

بە هەر جۆرێك بێت کەواتە نەخۆشیەکە مەترسیدارە.

---

١- الأمراض الجنسية: محمد علي البار، ل ٤١.

## نەخۆشی سەیەلان (السیلان)

یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە زۆر بڵاوە لە جیهاندا، وە لە بڵاوبوونەوەی خێرادایە، بە پێی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ساڵی ( ١٩٧٥ ) ٢٥٠ ملیۆن کەس توشی ئەو نەخۆشییە بوون، ئەوە بەپێی ڕاپۆرتی تەندروستی جیهانی بەم شێوەیە.

لە هەر ١٠٠،٠٠٠ سەد هەزار کەس لە:

- ❖ ئەمریکا ٤٧٠ کەس توشبووە.
- ❖ دانیمارك ٣٠٠ کەس توشبووە.
- ❖ فنلەندا ٣٠٠ کەس توشبووە.
- ❖ سوید ٢٥٠ کەس توشبووە.
- ❖ کەنەدا ٢٢٠ کەس توشبووە[١].

ئەم نەخۆشییە زیاتر ئافرەتان توشی دەبن، جۆرەکانی ئەم نەخۆشییە لای ئافرەتان ئەمانەن:

١. هەوکردنی بۆڕی میز.
٢. هەوکردنی گەرووی منداڵان.
٣. هەوکردنی دامێن.
٤. هەوکردنی میزڵدان.
٥. هەوکردنی حەوز (P.L.D).

---

١- الأمراض النفسیة: محمد علي البار، ل ٢٨٠.

٦. هەوكردنی كۆم بۆ ئەوانەی مومارەسەی سێكسی لەو ڕێیەوە دەكەن.

٧. هەوكردنی سەیلانی بەربڵاو.

٨. پەیدابوونی سەیلان لە دەوروبەری جگەر.

# ڕێگا گشتییەکان بۆ خۆپاراستن و چارەسەری تاوانی زینا

ئێمە لە میانەی بژاردنی هۆکارەکانی زینا باسی چارەسەرەکانیشمان کردووە، بەڵام لێرەدا بەتایبەتی ڕێگا سەرەکییەکان باسدەکەین، بۆئەوەی ئەوەی کە لەوێ باسنەکراوە لێرە باسی بکەین، لە پێناو زیاتر بەرچاو ڕوونیمان:

## یەکەم: بەهێزکردنی لایەنی ئیمانی

گومان لەوەدا نییە هەتا مرۆڤ بیروباوەڕی بەهێزتر بێت زیاتر دەتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵبێت و جڵەوی ئارەزووەکانی خۆی بکات، هەر بۆیە دەبینین پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت پاشان پیاوچاکان لە هەموو کەس زیاتر لە تاوانەکان دوور بوون، بەڵکو کۆمەڵگاشیان پەروەردە کردووە بەوەی کە لەتاوانەکان دوور بن بەتایبەت تاوانی زینا، هەر بۆیە دەبینین خوای گەورە کە دەیەوێت فەرمانێك بەسەر ئیمانداراندا بدات بە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، دەیاندوێنێت، ئەمە هاندان و وروژاندنە بۆئەوەی فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکەن، چونکە ئەوەی لە دوای ئەو فەرمانە دێت نیشانەی تەواوی ئیمانە یان نیشانەی پێکهێنانی ئیمانە ئەگەر فەرمان بێت، وە یان نیشانەی ناتەواوی ئیمانە یان هەڵوەشانەوەی ئیمانە ئەگەر نەهی بێت، بۆیە ئیمان ڕوناکییە، لە هەر شوێنێکیش ڕوناکی هەبێت تاریکی نامێنێت: ﴿۞ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي

زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٣٥﴾ [النور: ٣٥].

بێگومان ئیمان درەختی بەرداره کە ناخی بەزەویدا ڕۆچووه و قەد و باڵای بەهێزە و بەر و میوەی دەبێت لە کاتی خۆیدا: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدٗا رَّابِيٗاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ١٧﴾ [الرعد: ١٧].

بۆیە مرۆڤ تاکو لە ئیمان نزیکتر بێت لە زینا دوورترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن)[1].

---

١- البخاري: ٦٧٧٢، المسلم: ٥٧.

## دووەم: ئاگاداربوونی عیبادەتەکان

گومان لەوەدا نییە کە فەلسەفەی عیبادەت نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە، خۆشویستنی خوایە، ترسە لە خوا، پشت بەستنە بە خوا، بەرزبوونەوەی باڵانسی ڕوحییە، بەهێزبوونی لایەنی فریشتەییە لە مرۆڤدا، خاڵی بوونەوەیە بە ئەندازەی پێویست لە لایەنی ماددی و ئاژەڵی بوون و گەیشتن بە لوتکەی تێگەیشتن لە حیکمەتی دروستبوون و زانینی وەزیفەی بوون و تێگەیشتن لە سەرئەنجام و داهاتووی خۆت، مەگەر نوێژ بۆ چییە؟ بۆ ئەوە نییە کە لە خوا نزیکت بکاتەوە: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ [طه: ١٤]، مەگەر بۆئەوە نییە کە لە تاوانی گەورە و گچکە و نهێنی و ئاشکرا و ڕەفتار و گوفتاری خراپ دوورمان بخاتەوە: ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥﴾ [العنكبوت: ٤٥]، مەگەر ڕۆژوو بۆ پەیدابوونی تەقوا نییە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾ [البقرة: ١٨٣]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة أن يدع أكله وشربه)[١].

---

١- البخاري: ١٩٠٣.

مەگەر حەجکردن و قورئان خوێندن و زیکر و زەکات و قوربانی کردن و بیرکردنەوە بۆ چین ئەگەر لایەنی ڕوحیان بەهێز نەکات و پەروەردەی نەکات؟!

## سێیەم: ڕەوشتە بەرزەکان

کەسێك بچێتە سایەی درەختی ڕەوشت بەهرەمەند دەبێت لە یەك دونیا بەرهەم، میوە و حەسانەوە و ڕەوشتەکان لە ڕاستی و ڕاستگۆیی و ترسان و خۆشویستن و چاکەکاری و لێبوردەیی و بەخشندەیی و جوامێری و سوپاسگوزاری و ئازایەتی و بەزەیی و میهرەبانی و دڵسۆزی و خۆڕاگری و بە ویژدانی و بە وەفایی و میوانداری و فریادڕەسی و خۆ خواردنەوە و بە هاناوە چوون و کەم خۆری و کەم دوێی مەگەر لە پێویستیدا نەبێت و فەرمان بە چاکە ڕێگری لە خراپە و دووری لە ڕیایی و ڕوو پامایی و ئازارنەدانی خەڵك و منەت نەکردن و خۆ بەکەم زانی و خزمەتکردنی خەڵك و دۆستایەتی هەژاران و لەگەڵبوونیان و ڕوحی شوڕشگێڕی و قبوڵ نەکردنی زەلیلی و زەبوونی و ئامادەبوون لە کاتی پێویست ...هتد.

کەسێك خاوەنی ئەو ڕەوشتانە بێت چۆن لە زینا و خراپەکاری نزیك دەبێتەوە، چۆن ئەم تاوانە لە خۆی دەوەشێنێتەوە، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە ڕەوشت بەرزی وەسف دەکات: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤﴾ [القلم: ٤].

## چوارەم: چاو بەرهەڵدا نەکردن

خوای گەورە دەفەرموێت لە چاوتان بگرنەوە: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [النور: ٣٠]، یان هەمان شت بە ئافرەتان دەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ [النور: ٣١]، ئەوە سێ شت دەگرێتەوە:

١. مانای وایە چاو لە مەحرەمەکان ناگرێتەوە، چونکە نافەرموێت: چاوتان دابخەن، بەڵکە دەفەرموێت: لێی بگرنەوە.
٢. دەتوانیت لە کاتی پێویستدا بەکاری بهێنی وەك چارەسەری نەخۆش و شایەتی و فێرکردن.
٣. دەتوانی بە ئارەزو و شەهوانی بۆ ئافرەتانی بێگانە نەڕوانی، چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ ڕۆژانە توشی ئافرەتانی زۆر دەبین کە ناتوانین لێیان

نەڕوانین، کەواتە دەتوانین بە ئارەزووانە و شەهوانی لێیان نەڕوانین و بە پێی پێویست بێت.

## پێنجەم: خۆپاراستن لە ئافرەتانی بێگانە

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پیاوان لە چاوی خۆیان بگرنەوە، وە بە ئافرەتانیشی گوتووە کە لە چاوی خۆیان بگرنەوە، هەموو ئەو فەرمانانە لە پێناو ئەوەدایە کە کۆمەڵگا بە پاك و خاوێنی بمێنێتەوە و پیس نەبێت بە گوناه و تاوانەکان.

## شەشەم: ئارامگرتنی ئافرەتان لە ماڵەوە

خوای گەورە لە دەفەرموێت: ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا٣٣﴾ [الأحزاب: ٣٣].

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چوار شت بە ڕوونی هەیە:

١. ئارامگرتن لە ماڵەکان.

٢. خۆدەرنەخستن و خۆ ڕوتنەکردنەوە وەك سەردەمی نەفامی.

٣. ئەنجامدانی بەندایەتی لە گرینگترینیان نوێژ و زەکات، ئەم دوو بەندایەتییە زۆرترین کاریگەریان هەیە بۆ پەروەردەی مرۆڤ.

٤. گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

دیارە ئەمە ڕێگەی پاکبوونەوەیە لە تاوان، دوایش دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٤﴾ [الأحزاب: ٣٤].

پێشتریش لە هەمان سورەتدا: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢﴾ [الأحزاب: ٣٢]، ڕێگری کردبوو لە دەنگ ناسککردن و سەرنجڕاکێشانی خەڵك، وە فەرمانی پێکردبوون کە قسەی باش بکەن.

## حەوتەم: سەفەر نەكردن و دوور نەكەوتنەوە بەبێ مەحڕەم

هەتا دەكرێت پێویستە ئافرەتان پابەندی حەیا و ئادابە شەرعییەكان بن، بەتایبەت ئەگەر شوێنەكە خراپ بوو یان خەڵكی خراپ بوو نابێت ئافرەتان بڕۆن بۆ ئەو جێگایانە بەبێ مەحڕەم، بەڵام ئەگەر لە دین و ڕەوشتی دڵنیا بوو و مەترسی لەسەر نەبوو لەگەڵ خەڵكانی باش و ئافرەتانی جێگەی متمانە بوو زەرەری نییە، وەك ئافرەتان كە لەمڕۆدا دەچن بۆ حەج و عەمرە یان بەشی ناوخۆیی یان سەردانی خزمان، ئەو كاتە حەرام نییە و بێ شەرعی نییە، چونكە ئامانج لە بوونی مەحڕەم دڵنیا بوونە لە توش نەبوونی خراپە و دەستدرێژی لێنەكران، مادام ئەو ئامانجە بەدی بێت كەواتە بێ شەرعی نییە.

## هەشتەم: دوورنەكەوتنەوەی ژن و پیاو بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ

بەداخەوە لەمڕۆدا دەبینین خەڵكانێك هەن بەهۆی ئەوەی كە لە یەكێك لە خزمانی ژنەكەی نیگەرانە لە سە رجێی ژنەكەی دوور دەكەوێتەوە، یان ئەگەر ژنەكەی ڕێگربێت لە ژن هێنان یان دەڕوات بۆ هەندەران یان نەهاتنەوە بۆ ماڵ مەگەر بە درەنگ وەختی و كاتی خەوتنی ماڵ و منداڵ بێت.

## نۆیەم: دوورکەوتنەوە لە شوێنە خراپەکان

بمانەوێت یان نا مرۆڤ بە ژینگەی دەوروبەر زۆر کاریگەر دەبێت، بۆیە ناکرێت بڵێی: من لە شوێنی مەیخانە کاردەکەم و توشی خراپە نابم، یان لە شوێنی مەساج و ئارایشتگای خراپ کاربکەی و بڵێی: من لەخۆم ڕا دەبینم، هەر بۆیە موهاجیری ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە تاوان کۆچ بکات: (المهاجر من هجر ما نهى عنه الله)[1]، هەروەك گوتراوە مرۆڤ کوڕی ژینگەی خۆیەتی.

## دەیەم: هاوڕێی باش

یەکێك لە باشترین هۆکار و چارەسەری دورکەوتنەوە لە تاوانی زینا هاوڕێی باشە، بێگومان لە ڕادە بەدەرن ئەوانەی بەهۆی هاوڕێی خراپەوە توشی تاوانی زینا بوون، وە بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

## یازدەیەم: زەواج کردن لەگەڵ کەسی باش

گومان لەوەدا نییە لە دوای ئیمان چاکترین هۆکاری خۆپاراستن لە تاوانی زینا زەواج کردنە لەگەڵ ئافرەتی باش یان ژن لەگەڵ پیاوی باش.

بەداخەوە لەمرۆدا پرۆسەی زەواج تەواو سست بووە، ئەوەش هۆکاری زۆرە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵات و وەزارەتە پەیوەندیدارەکان، بە

---

١- مسند إمام أحمد: ٦٩١٢.

شێکی پەیوەستە بەلایەنی بەرهەڵایی و بەشێکی باوك و دایکان لێی بەرپرسن، بەشێکی کوڕان و بەشێکی کچان، وە ئەو بابەتە پێویستی بە چەندین کۆنفرانس و لێکۆڵینەوە و داتای زانستی ورد هەیە.

## دوازدەیەم: شوێنەواری کۆمەڵایەتی خراپ

لە هەر کۆمەڵگایەك کە خراپەکاری ئاسان بوو، هەر دوو ڕەگەز پشت لەزەواج دەکەن، هەوڵدەدەن بە شێوازی تر حەزەکانی خۆیان دامرکێنن.

لە بەشێك لە وڵاتانی ئەوروپا ڕێژەی زەواج ١٪ کەمترە، باشە ئەو گەنجانە لە چ ڕێگایەکەوە ئارەزوی خۆیان دادەمرکێنن؟

بۆیە ئەگەر کۆمەڵگا خراپەکاری تێدا بڵاوبوو وە بوو بە دیاردە و نەریت، تاوانی زینا بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات.

## سێزدەیەم: بیرکردنەوە لە سزای دوا ڕۆژ

گومان لەوەدا نییە کە ئەو کەسەی بڕوای بە خوا و بە دوا ڕۆژ هەیە باشتر دەتوانێت خۆی بپارێزێت لە زینا و هەمووومان بە تەواوی هەستی پێدەکەین لە گەنجەکانماندا، بۆ نمونە ١٠٠ گەنج لە ئەهلی مزگەوت بێنە وە ١٠٠ گەنج لە باڕ و قومارخانەکان بێنە، ئینجا بەراوردیان بکە و بزانە ڕێژەی تاوان بە گشتی و تاوانی زینا بەتایبەتی چەند جیاوازە لەو دوو پێڕەدا، خوای گەورە تەنانەت پێخۆشبوونی زیناشی بە تاوان داناوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ

ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩﴾ [النور: ١٩].

## چواردەیەم: بیركردنەوەی ژیرانە

یەكێك لە چارەسەرە گرینگەكان بەكاربردنی ژیرییە، لە كۆمەڵگای ئەمڕۆ دەتوانی ڕێگای ئاسان بدۆزیەوە بۆ زەواجكردن بۆئەوەی توشی زینا نەبیت، بێگومان ئافرەتانی واش هەن كە باری هاوسەرەكانیان زۆر گران ناكەن یان هاوكاریان دەبن، كەواتە ژیری ڕێگرە لەوەی پەنا بۆ ئەو بەدڕەوشتی و دەرد و بەڵایە ببەی.

بۆیە دەكرێت كەسی ژیر دین و كەسایەتی و بنەماڵە و دین و دینداری خۆی بپارێزێت ئەگەر ژیری بەكاربێنیت، نەوەك پەنا بۆ ئەو تاوان و خراپە و داڕمانی كەسایەتی و ئەخلاقییە ببردرێت.

## پازدەیەم: بیركردنەوەی زانستییانە

بە پێی زانستی پزیشكی دەیان نەخۆشی ترسناك لە ڕێی پەیوەندی نا شەرعی بڵاودەبێتەوە، ئەگەر ئێمە ڕاستدەكەین بڕوامان بە زانست هەیە و بەشێوەی زانستی هەڵسوكەوت دەكەین نابێت ڕازی ببین بە تاوانی زینا و هەموو جۆرە لادانە جنسییەكان.

## شازدەیەم: ڕۆڵ و کاریگەری میدیا

میدیا بە هەموو بەشەکانیەوە دەکرێت بەشێکی بەرچاو بێت لە چارەسەری بڵاوبوونەوەی زینا نەوەك ڕاستییەکان بشارێتەوە، بەوەی کە هەڵسێت بە پێشکەشکردنی:

١. بەرنامەی زانستی و پڕ داتا لەسەر زیانەکانی پەیوەندیە جنسییەکان.

٢. ڕاپۆرت کردن لەسەر زیانەکانی زینا بە داتا و بە وێنە و لێدوانی دکتۆرە بەڕێزەکان.

٣. برەودان بە بەرنامەی ئایینی و پەروەردەیی.

## حەڤدەیەم: دواندنی فیترەت

مرۆڤ ئەگەر ناخی خۆی بدوێنێت بەڕاستی دوور لە کاریگەری ئەم لاولا دەگاتە یەقین کە زینا کارێکی بەد و ناڕەوا و نابەجێ و پێچەوانەی دڵ و دەرون و فترەتی خاوێنە.

کێ هەیە بە زەواجی باش ئارام نەبێت؟! کێ هەیە ئەگەر ناخی کوێر نەبووبێتەوە بە خیانەت کردن و زینا کردن دڵگران نەبێت؟!

## هەژدەیەم: خۆپاراستن لە گۆرانی و مۆسیقای بێکەڵك

سەبارەت بە حوكمی گۆرانی و مۆسیقا ڕا جیایی زۆر هەیە:

- هەندێك حەرامی دەکەن.
- هەندێك بەڕەوای دادەنێن.
- هەندێکیش وردەکاری تێدا دەکەن، نە هەموو جۆرەکانی حەرام دەکەن نە هەموو جۆرەکانی حەڵاڵ دەکەن، هەر ئەمەش ڕای ڕاجح و پەسەندە بە بەراورد لە نێوان بەڵگەکاندا، ئێمە نامانەوێ لێرە موناقەشەی ئەو بابەتە بکەین، چونکە چەندین کتێبی لەبارەوە نوسراوە، بەداخەوە بەشێکی زۆر لە گۆرانی و مۆسیقا بوو بە بەریدی خراپەکاری و تێکەڵبوون هەتا زینا کردنیش.

بۆیە چارەسەر ئەوەیە کە ئەو خراپانە بەدیلیان بۆ بدۆزرێتەوە لە هونەر و ئەدەبی ئیسلامی و تەسك نەکردنەوەی ڕێگا حەڵاڵەکان.

## نۆزدەیەم: خۆپاراستن لە مادده هۆشبەر و سڕکەرەکان

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە عەرەق و مادده سڕکەرەکان هاوەڵی نزیکی هەموو جۆرە تاوانەکانن، زۆرن ئەوانەی بەهۆی عەرەق و قومار و مادده هۆشبەرەکان توشی تاوانی زینا دەبن، بۆیە هەر هەوڵێك بۆ کەمکردنەوەی ئەو مادده پیسانە چارەسەرە بۆ دوورکەوتنەوە لە تاوانی زینا.

## بیستەم: دوورکەوتنەوە لە گۆشتی بەراز و شتە پیسەکان

دەرکەوتووە بە تاقیکردنەوە و بە شێوەی زانستی و واقعی خواردنی گۆشتی بەراز کاریگەری خراپی لەسەر غیرە هەیە لای هەر دوو ڕەگەز.

## بیست و یەکەم: دروستکردنی ڕێکخراوی ئامانجدار و پەروەردەیی

گومان لەوەدا نییە کە ئەمڕۆ چەندین ڕێکخراوی فیمینزمی هەن کار دەکەن لەسەر:

- بێمنەتکردنی ژن و پیاو لە یەکتری.
- کردنەوەی چەندین ڕێگای خراپ بە ناوی دەورات و فێرکردنی زمان و ڕەشاقە، بەڵام بە ئامانجی تر.
- بە ئیلحاد کردنی ئافرەت بە فێرکردن و سیدی و نامیلکە.

**جا بۆیە دەبێت جێگرەوەی ئەوانە هەبێت بە:**

- ✓ خولی زمانەوانی.
- ✓ خولی پەروەردەیی.
- ✓ خولی وەرزشی.
- ✓ خولی لەبەرکردنی قورئان.
- ✓ قوتابخانە و مەداریسی ئامانجداری پەروەردەیی.
- ✓ ڕێکخستنی گەشت و گەڕانی پڕ زانستی ئامانجدار، وە دەکرێت چەندین شتی تر بکرێتە بەدیل.

- ✓ وە دەکرێ دەوڵەمەند و خێرخوازان ڕۆڵی کارایان هەبێت لەو مەجالانەدا.
- ✓ وە دەکرێت بەردەوام پێشبڕکێ و هەوڵدان هەبێت، هاوکات لەگەڵ پێدانی پاداشتی ماددی و مەعنەوی.

## بیست و دووەم: جێبەجێکردنی حوکمە شەرعییەکان

١. گومان لەوەدا نییە کە پەروەردگار لە بەرامبەر تاوان سزای داناوە.

٢. ئەسڵ لە سزادان دوا ڕۆژە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە لە دونیادا سزا نەبێت.

٣. لە ئیسلامدا سزا بە قەدەر تاوانە، نا بێت لە بەرامبەر تاوانێکی بچوك سزایەکی گەورە هەبێت، یان بە پێچەوانەوە.

٤. سزا دوو بەشە.

- ➢ بەشی یەکەم حەددەکان (الحدود).
- ➢ بەشی دووەم تەمبێ کردنە.

٥. ژمارەی حەددەکان ڕاجیایی لەسەرە لە نێوان زانایان.

٦. بنچینەیەکمان هەیە دەڵێت: (رعاية الحقوق أولى من إقامة الحدود).

٧. جێبەجێکردنی حەددەکان چەندین مەرجی هەیە، تاکو مەرجەکان نەیەنەدی سزاکان جێبەجێ ناکرێن.

٨. نابێت مانع و ڕێگر هەبێت لە جێبەجێکردنی سزاکە.

٩. بە گومانەوە حەدد جێبەجێ ناکرێت: (ادرؤوا الحدود بالشبهات).

١٠. دەبێت دادگا بڕیاری کۆتایی بدات لەسەر تاوانەکە، ئەگەر تاوانەکە زینا بێت.

وێڕای ئەوانەی کە باسکران دەبێت:

أ- زینایەکە یان دەبێت لە ڕێی دانپێدانان بسەلمێندرێ یان لە ڕێی چوار شاهێدەوە یان لە ڕێی دوو گیان بوونەوە.

ب- دەبێت یەکێك هەبێت سکاڵا پێشکەش بکات.

ت- بوهتانکردن بە کەسێك تاوانێکی گەورەیە، ٨٠ هەشتا دار لە بوهتانچیەکە دەدرێت.

ث- دەبێت شاهێدەکان هەموویان یەك دەنگبن و ئیفادەکەیان یەك بێت، ئەگەرنا حەددی بوهتانیان لێدەدرێت.

ج- هەتا ئێستا لە مێژووی دوور و درێژی ئیسلام تاوانی زینا بە شاهێد ئیسپات نەبووە.

ح- باشتر وایە کە خەڵك دان نەنێت بە تاوانی زینا، بەڵکو لە بەینی خۆی و خوادا تەوبە بکات.

خ- ئەو کەسەی کە ئاگاداری تاوانەکەیە دەبێت سەتری بکات و دایبپۆشێت نەك باسی بکات، چونکە سەترکردنی باشترە.

د- وا چاکە ئیمامەکە تەلقینی ئەوانە بکات کە تاوانەکەیان ئەنجامداوە پەشیمان ببنەن.

ذ- ئەو كەسەی بە دانپێدانان تاوانەكەی لەسەر ئیسپات بووە، دەتوانێت لە دانپێدانانەكە پەشیمان بێتەوە لە پێش بڕیاری حاكم لە میانەی جێبەجێكردنی سزاكە.

ر- هەتا بكرێت حاكم پشت بكاتە جێبەجێكردنی حەددەكە، مادام دەرچەیەك هەبێت، وەك پێغەمبەر ﷺ كردی لەگەڵ ماعیزی ئەسلەمی.

ز- ئەگەر بابەتەكە لە نێوان ژن و مێرددا بوو، واتا شاهێدەكە بەتەنها مێردەكە بوو، ئەو كات (الملاعنة) دەكرێت لە نێوان ژن و مێردەكەدا، واتا حوكمەكە جێبەجێ ناكرێت.

حاكم بانگی مێردەكە دەكات پێی دەڵێت: چوار جار بڵێ: (أشهد بالله) من لە ڕاستگۆیانم كە ژنەكەم تاوانبار دەكەم بە زینا، ئەگەر ژنەكە بە و زینا دوو گیان بێت دەبێت بڵێت: ئەو منداڵە لە من نییە، جاری پێنجەم لە دوای ئەوەی حاكم ئامۆژگاری دەكات و دەیترسێنێت بە سزای ڕۆژی دوایی دەبێت بڵێت: نەفرەتی خوام لێبێت ئەگەر لە درۆزنان بم.

ئینجا ئەگەر ژنەكە دانینا بە تاوانەكەی ئەوە سزاكەی لەسەر جێبەجێدەكرێت، وە ئەگەر دانینەنا بە تاوانەكەی ئەوا ئەویش دەبێت چوار جار بڵێت: (أشهد بالله) مێردەكەم لە درۆزنانە لەوەی كە من تاوانبار دەكات بە زینا، ئەو منداڵەش لەوە ئەگەر دوو گیان بوو، بۆ جاری پێنجەم دوای ئەوەی كە حاكم ئامۆژگاری دەكات دەبێت بڵێت: توڕەیی و غەزەبی خوام

لەسەر بێت ئەگەر هاوسەرەکەم لە ڕاستگۆیان بێت، لە دوای ئەوە حاکم بڕیار دەدات بە:

١. لێکجیاکردنەوەیان بۆ هەتا هەتایە، ئەمە بەلای زۆرینەوە.
٢. مارەیی تەواو دەدرێت بە ژنەکە.
٣. منداڵەکە دەدرێت بە ژنەکە.

بەم شێوەیە خیانەتی زەوجی چارەسەر دەکرێت، پەنا نابردرێتە بەر چەقۆ و دەمانچە و زیندانی کردن.

وە ئەگەر هاتوو زینا ئیسپات بوو لەسەر هەر کامێکیان چ:

❖ داننان بە تاوانی زینا.
❖ شایەتی چوار کەس.
❖ یان لەڕێی دوو گیان بوونەوە.

بە جێبەجێ بوونی مەرجەکان و نەبوونی ڕێگرەکان سزاکە لەسەر تاوانبارەکە جێبەجێدەکرێت.

## ئایا سزای تاوانی زینا دار لێدانە یان بەردباران کردنە؟

## ئایا جیاوازی هەیە لە نێوان کوڕ و پیاو یان کچ و ژن؟

## ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی کردووە؟

هەوڵ دەدەین ئەم سێ پرسیارە بە چڕی وەڵام بدەینەوە إن شاء الله.

لە پرسیاری سێیەمەوە دەستپێدەکەین: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی کردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی کردووە، کۆمەڵێك بەڵگەمان لە فەرموودەدا هەیە بۆ نمونە:

صحیح البخاري بە ژمارە:

١. ٦٨١٢ كتب التسعة.
٢. ٦٨١٣ البخاري.
٣. ٦٨١٤ البخاري.
٤. ٦٨١٥ البخاري.
٥. ٦٨١٦ البخاري.

صحیح مسلم بە ژمارە:

١. ١٦٩١ مسلم.

٢. ١٦٩٥ مسلم.

سنن ابن ماجە بە ژمارە:

١. ٢٥٥٤ ابن ماجه.

٢. ٢٥٥٥ ابن ماجه.

سنن أبو داود بە ژمارە:

١. ٤٤١٥ أبو داود.

٢. ٤٤١٨ أبو داود.

کەواتە کۆمەڵێك فەرموودە هەیە بۆمان دەسەلمێنێت کە ڕەجم هەبووە، بەڵام ئەو ڕەجمە کەی بووە و چۆن بووە؟

سێ بۆچوونی سەرەکی هەیە بۆ ئەم بابەتە:

یەکەم: بەشێك لە زانایان پێیان وایە کە ئەم ڕەجمە بەپێی شەریعەتی یەهودی بووە، بەڵام دواتر ئیسلام بریاری تری دەرکرد کە سزاکەی جەڵد لێدانە.

دووەم: ئەوەیە کە ئەو ڕەجمە هەبووە بەپێی شەریعەتی ئیسلام، بەڵام دواتر بڕیارەکە بوو بە دار لێدان.

سێیەم: ڕەجمکردن دەکەوێتە بازنەی تەمبێکردن.

ئایا بەپێی قورئانی پیرۆز ئەگەر تەئویل نەکرێت حوکمی زیناکردنی پیاو و ژن دار لێدانە یان ڕەجمکردنە؟

لە قورئانی پیرۆزدا هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ ڕەجمکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو ئاماژەکان پێچەوانەن:

❖ ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ٢﴾ [النور: ٢]. باسی سزای زیناکار دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَٱجۡلِدُواْ﴾.

❖ ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ٣﴾ [النور: ٣]. باس لەوەدەکا کە زیناکار ژن دەهێنێت و مێرد دەکات، باشە کە ڕەجمکراوە چۆن دەتوانێت ئاهەنگی ژنهێنان و شووکردن بگێڕێت.

❖ ﴿وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ٨ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ٩﴾ [النور: ٨-٩]. کە باسی (الملاعنة) دەکات دەفەرموێت: ﴿وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ﴾، دیارە ئەو عەزابە هەمان عەزابە کە لە ئایەتی دووی هەمان سوڕەت باسکراوە، کە دیارە سزاکە لەوێدا دار لێدانە نەك ڕەجمکردن.

❖ ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ

أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴿٢٥﴾﴾ [النساء: ٢٥]. باسی کەنیزەك کراوە کە ئەگەر هاتوو تاوانی زینای ئەنجامدا سزا دەدرێت، سزاکەشی نیوەی کەسێکی ئازادە، دیارە کەسی ئازاد بێ جیاوازی خێزاندارە یان نا دەبێت ١٠٠ داری لێبدرێت، ئەم کۆیلەیەش دەبێت نیوەی ئەو سزایەی لەسەر جێبەجێ بکرێت کە ٥٠ دارە، گومان لەوەدا نییە کە مردن ناکرێت بە نیوە.

❖ ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴿٣٠﴾﴾ [الأحزاب: ٣٠]. خوای گەورە باسی سزا دەکات: ﴿يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ﴾، کە دیارە فاحیشە لە هەر شتێك زیاتر زینا دەگرێتەوە: ﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا﴿٣٢﴾﴾ [الإسراء: ٣٢]. مەبەست لە سزادانەکەش دار لێدانە، چونکە مردن چەند قات ناکرێتەوە، کەواتە ئەگەر کاری فاحیشەیان ئەنجامدا دەبێت ٢٠٠ داریان لێبدرێت.

❖ وە جیاوازی لە نێوان مردن و سزاداندا هەیە، خوای گەروە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴿١٦٨﴾﴾ [آل عمران: ١٦٨]. لەوێ

دەفەرموێت: ﴿فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ﴾، كەواتە مردن لە ئایەتەكەدا جیاوازە لە سزادان.

❖ لەوانەیە بگوترێت ڕەجمیش هەر سزایە، بەڵام قورئانی پیرۆز جیاوازی پێكردوون لە یەك كاتدا: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٨﴾ [يس: ١٨].

❖ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١﴾ [الطلاق: ١]. لەیەكێك لە دیارترین ماناكانی فاحیشە تاوانی زینایە، بە مانای تریش دێت، بەڵام هیچ موفەسیرێك نییە ئەمەی باس نەكردبێت، بەڵام خوای گەورە نافەرموێت: ئەگەر فاحیشەیان ئەنجامدا بیانكوژن، بەڵكو دەفەرموێت: مافی ئەوەیان نابێت لەماڵی مێردەكانیان بمێننەوە.

❖ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ١٩﴾ [النساء: ١٩]. ئەم ئایەتە باس لەوە دەكات ئەگەر هاتوو ئافرەت فاحیشەی ئەنجامدا لە هەندێك لە مافەكانی

بێبەش دەکرێت، کەواتە باسی کوشتن نەکراوە، بەڵکو باسی بێبەشکردن کراوە لە بەشێك لە مافەکانی.

❖ ﴿وَٱلَّـٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥﴾ [النساء: ١٥]. ئەو ئایەتە باس لە سزادان دەکات ئەویش (الإقامة الجبرية) هێشتنەوەیە لە ماڵەوە هەتاکو دەمرێت یان خوای گەورە دەروی لێدەکاتەوە و بڕیاری تری بۆ دەدات، کەواتە ڕێگاکە دەبێت یان ڕەجم بێت یان دار لێدان.

❖ لە ئایەتەکەی دواتردا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦﴾ [النساء: ١٦]. باس لەوەیە ئەزیەت بدرێت، ئەزیەتدان زیاتر گونجاوە لەگەڵ دار لێدان نەوەك کوشتن.

مەبەستمان ئەوەیە ئایاتەکە وشەی (الذان) بۆ تەغلیب بەکارهێنابێت مەبەست لە ژن و پیاو بێت کە زینا دەکەن، دەنا ئەگەر مەبەستی نێربازی بێت ئەوە حوکمەکەی ئەزیەتدان و تەمبێ کردنە.

❖ ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ

عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٧٠﴾ [الفرقان: ٦٨-٧٠]. باسی زینای کردووە بەڵام تەنها سزای قیامەتی باسکردووە و باسی دونیا ناکات.

ئەو فەرموودەیەی کە باسی (الشيخ و الشيخة) دەکات ئایا دەکرێت بکرێتە بەڵگەی ڕەجم وە ئایا دەکرێت ئەمە ئایەت بێت وەك دەڵێن؟

سەرەتا بە چەند دەستەواژەیەك هاتووە:

- الشيخ والشيخة إذا زنيا فرجموهما البتة.
- الشيخ والشيخة إذا زنيا فرجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز عليم.
- الشيخ والشيخة إذا زنيا فرجموهما البتة بما قضيا من اللذة.
- إذا زنى الشيخ والشيخة فارجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز حكيم.

**بۆیە:**

- ئەم فەرموودەیە ناکرێت قورئان بێت، بەڵکو ئەمە عورفی یەهودییە.
- ئەم هەموو جیاوازیانە لەو بەناو ئایەتانەدا لە ئسلوبی قورئان نییە.
- کەسێك شارەزایی لە بەلاغە و ئسلوبی قورئاندا هەبێت دەزانێت کە ئەوە ئسلوبی قورئان نییە.
- ئەگەر ئایەتە بۆ لە قورئاندا نییە، ئایا عومەر هێندە ترسنۆك بووە نەوێرێ ئایەتی قورئان بنوسێتەوە.
- ئەی باشە قورئان لە زەمانی ئەبوبەکر کۆنەکرایەوە، ئەدی ئەو ئایەتە لە کوێ بوو.

❖ بۆچی عومەر ئەو ئایەتەی چەند هەفتە پێش مردنی باسکرد، بۆ پێشتر باسی نەکرد؟

❖ قورئان هەمووی موتەواتیرە ئەم فەرموودەیە ئاحادە، ئەمە قەت نابێتە قورئان.

❖ ئەم دەستەواژانە ڕەجمی بەستۆتەوە بە (الشیخوخة) پیر، نەك (المحصن)[١] ژنی هێنا بێت یان مێردی کردبێت، بۆی هەیە کەسێك زۆر بە تەمەن بێت ژنی نەهێنابێت وە کەم تەمەن بێت ژنی هێنابێت و شووی کردبێت.

❖ ئەوجا حیکمەت چییە لەوەی کە حوکمەکەی ماوە و وشەکانی نەماون؟

❖ ئێمە ئەگەر بە ڕیوایەتە ئاحادەکان تەعامول بکەین دەبێت قورئان پەلەوەڕ خواردبی![٢]، وە دەبێت سورەتی ئەحزاب بەقەدەر بەقەڕە بووبێت ؟![٣]

ئەگەر ڕەجم حەددێك بێت لە حەددەکان بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لادەدات لە جێبەجێکردنی، لە ڕوداوەکەی ماعیزی ئەیلەمیدا بە ڕوونی ئەمە دیارە.

ئەسڵ ئەوەیە کە خوێنی خەڵك پارێزراو بێت مەگەر بە بەڵگەی شەرعی نەبێت.

---

١- مجموعة الأبحاث القرآنية: للزلمي، ج ١١.

٢- رواه ابن ماجه: ١٩٤٤.

٣- مسند الإمام أحمد: ٢١٢٠٦.

## چەند سەرنجێکی تر:

١. جۆرەها سزا هاتووە لە قورئاندا سەبارەت بە تاوانی زینا، بۆچی ڕەجمی تێدا نییە، لەو سزایانە:

أ- دار لێدان.

ب- بێبەش (محروم) بوون لەزەواج لەگەڵ کەسی دامێن پاك.

ت- ملاعنة و دوورخرانەوە لە یەکتر.

ث- ناوی لێندراوە (الخبیث).

ج- (حەبس) زیندانی کران.

ح- ئەزیەتدان.

خ- دەرکران لە ماڵی مێرد.

د- بێبەشکران لە بەشێك لە مارەیی.

ذ- بێبەش (محروم) بوون لە منداڵ دەربارەی پیاوەکە.

٢. نەهی کردن لە تاوانی زینا و سزای قیامەتی ئەو هەموو سزایانە باسکراون، بۆچی ڕەجم باس نەکراوە کە کوشتنە؟!

٣. ئایا لەبەرچی تاوانی زینا سزاکەی توند دەکرێت لە جڵدەوە بۆ ڕەجم کردن، حیکمەتەکەی چییە، ئەگەر حیکمەتەکەی ئەوەیە ژنی هەیە یان مێردی کردووە، دەبینی ئێستا ژنی نەماوە یان ژنەکە بێوەژنە، ئەی بۆچی شەریعەت لەگەڵ سەتردایە، کە لابردنی سزایەکەیە نەك کوشتن، وە هەر شتێك زیاتر خەڵك پێوەی گیرۆدە بوو دەبێت بەیان و ڕونکردنەوەی تەواوی تێدا بکرێت نەك نادیار و ناڕوون بێت.

٤. وه ئه‌گه‌ر ده‌قی قورئان و سوننه تێكگیران له بابه‌تێكی دیاریكراو، بێگومان كار به‌قورئان ده‌كرێت، چونكه به‌ڵگه‌یه‌كی به‌هێزتره (لأنه أقوى دليلا).

٥. (لا ينسب إلى ساكت قول)، واته: كه‌سی بێده‌نگ هیچ قسه‌یه‌كی نادرێته پاڵ كه‌واته مادام قورئان باسی نه‌كردووه و حوكمی تری داناوه، نابێت بیده‌ینه پاڵ قورئان، ئه‌مه وه‌ك ژماره‌ی ڕه‌كعه‌ت و سوجده نییه بڵێین: به‌یان نه‌كراوه، بابه‌تی زینا ته‌واو به‌یانكراوه.

٦. (الشك يغير لصالح المتهم) ئێستا مادام وای لێهات قازانجی تاوانباره‌كه چییه، ئا به‌و شێوه‌یه ده‌قه‌كه ته‌فسیر بكه‌ین، له كاتێكدا هیچ نادیارییێك له ده‌قه‌كه‌دا نییه[١].

---

١ الكامل للزلمي في الشريعة والقانون.

## ڕەجم لە لای زانایانی سەردەم

بەشێکی بەرچاو لە زانایانی هاوچەرخ کە پێگەی تەواویان هەیە لە کۆمەڵگەدا لەگەڵ ڕەجم نەبوون، لەوانە:

١. محمد أبو زهرة، کە یەکێکە لە گەورە زانایانی مصر.

٢. محمد صنقور، لە ژێر ناونیشانی ئایەتی ڕەجم قورئان نییە ( ئاية الرجم ليست قرآنا).

٣. بابكر فيصل بابكر، لەژێر ناونیشانی (مجمع الفقه الإسلامي ورجم الزاني المحصن).

٤. د. مصطفى محمود، لە ژێر ناونیشانی (لا يوجد الرجم في القرآن).

٥. يوسف القرضاوي لەگەڵ هەمان ڕا و بۆچوون دایە کە بۆخۆی ڕوداوی محمد أبو زهرة باس دەکات، کە گوتی بۆمبەکە نە تەقێنمەوە.

٦. مصطفى زەڵمی باشترین نوسینی لەو بارەوە کردووە بە ناوی (لا رجم في القرآن).

٧. عەلی باپیر یەکێك لە زانا بەتواناکانی کوردستان هەمان بۆچوونی هەیە.

لەڕاستیدا پاڵنەری زینا شەهوەتە چۆن لە کوڕ و کچدا هەیە بە بەهێزتریش لە پیا و ژندا هەیە، چونکە ئەو کەسەی کە مومارەسەی جنسی کردبێت دواتر خێزانی نەمێنێت یان مێردی نەمێنێت کەمتر خۆی پێڕادەگیرێت، وە دەتوانێت بیکا و کەسیش پێی نەزانێ، بۆیە پێم وا نییە ئەو سزایە ڕێی لێبگرێت.

## ئایا لەمڕۆدا ئەو سزایە چۆن جێبەجێ دەكرێت؟

١. شەریعەت لەگەڵ سەتر و پەردەپۆشكردندایە نەك سزادان.

٢. سەلماندنی تاوانی زینا یان دەبێت لەڕێی دانپێدانانەوە بێت یان لەڕێی چوار شاهیدەوە بێت، كە لە مێژووی ئیسلامدا لەو ڕێیەوە تاوانی زینا ئیسپات نەبووە.

٣. بەپێی فەرموودەكە دەبێت ئیمام یان دادوەر تەلقینی تاوانبار بكات بۆئەوەی دانی پێدانەنێت.

٤. تاوانبار دەتوانێت پەشیمان بێتەوە بەر لە دەرچوونی بڕیارەكە و لە كاتی دەرچوونی بڕیارەكە و دوای دەرچوونی بڕیارەكە.

٥. ئەمڕۆ لە یاسای سزادان باسی یاسای خیانەی زەوجی كراوە ئەویش بە مەرجەكانی خۆی.

٦. با ئێمە بە قسەی زل و گەورە خەڵك نەتۆقێنین، جارێ خۆمان ژێر دەستەین، بەڵام هەڕەشەی ڕەجم لە تاوانكارانی زینا دەكەین! دەبێت ئێمە ئیسلام وەك ڕەحمەت وێنا بكەین نەك هەڕەشە و پەلدان بۆ هەركەسێك موخالەفە بكات.

٧. وا چاكە یاسای ڕەجم لە یاسای سزادان لابربردرێت، ئەگەر هەر وڵاتێك ویستی بەپێی شەرع لەسەر تاوانی زینا سزا بدات.

٨. بەڵام دەبێت حاڵەتی دەستدرێژی سێكسی (ئیغتیصاب) بۆ سەر ئافرەت یان منداڵ یان پیاو بخرێتە خانەی ئیفسادەوە، بەو شێوەیە كە دەبێتە زەجر بۆ تاوانەكە سزا دابندرێت.

٩. لەبیرمان نەچێت (رعاية الحقوق أولى من إقامة الحدود) با جارێ مافی خەڵك دابین بكەین و خۆشگوزەرانیان بۆ فەراهەم بێنین ئەوجا باسی سزا بكەین، وە ئێمە شەرم ناكەین لە سزا، چونكە هەموو یاساكانی سەر زەوی باس لە سزادان دەكەن.

بۆیە ئێمە كە باس لە ڕێگا چارەسەركان دەكەین دەبێت سزادان بەشێك بێت لە چارەسەر، نەك تۆقاندن و ترساندن.

# كۆتایی

قسەی كۆتاییم لەم چەند خاڵەدا كورت دەكەمەوە:

- ئیسلام بەرنامەیەكی گشتگیرە بۆ هەموو لایەنەكانی ژیان هیچ شتێكی فەرامۆش نەكردووە، هەر شتێك پێویست بێ یان بە دەق یان بە عەقیدە باسی كردووە و چارەسەری بۆ داناوە.
- تاوانی زینا لە هەموو دینە ئاسمانییەكاندا قەدەغە كراوە، وە لە هەموو دەستورە زەمینییەكاندا سنوردار كراوە بە جۆرێك لە جۆرەكان.
- لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا تێگەیاندن و گرتنبەری ڕێگاچارەكانیش جێبەجێكردنی سنورەكانە.
- ئیسلام باشترین پاڵنەرە بۆ نەهێشتن و كەمكردنەوەی تاوان ئەمە بە كردەییش سەلمێنراوە و دەكرێ زیاتریش تاقی بكرێتەوە.
- نەهێشتن و كەمكردنەوەی ئەم تاوانە هەوڵ و تێكۆشان و كۆنفرانس و لێكۆڵینەوەی پێویستە، بەڵام ئەمە تەنیا وەبیر خستنەوە و دەست خستنە سەر برینەكەیە.
- بە داخەوە لە وڵاتی ئێمە نەك بیر لە چارەسەر ناكرێتەوە، بەڵكو ئاسانكاری بۆ ئەو تاوانە قێزەونە دەكرێ بە جۆرەها شێوە.

داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ئەم کارە بچووکەمان لێ وەربگرێ بە گەورەیی خۆی.

**و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

چوارشەم ٢١\١٠\٢٠٢٠ زایینی
٤ی ڕەبیعولئەووەلي ١٤٤٢ کۆچی

# سەرچاوەكان


١. صحيح البخاري.
٢. مسند أبو داود.
٣. سنن الترمذي.
٤. سنن النسائي.
٥. سنن ابن ماجة.
٦. المستدرك.
٧. صحيح مسلم.
٨. صحيح جامع الصغير و زيادته.
٩. مسند الإمام أحمد.
١٠. سنن النسائي الكبرى.
١١. المعجم الوسيط لنخبة من العلماء.
١٢. القاموس المحيط فيروس آبادي.
١٣. تهذيب اللغة.
١٤. الصحاح تاج اللغة و صحاح العربية – الفارابي.
١٥. كتاب الحديث - الفراهيدي البصري.
١٦. تحفة الفقهاء.
١٧. الذخيرة.

١٨. المهذب في الفقه الشافعي.
١٩. الهدايه على مذهب أبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.
٢٠. رواه البيهقي في السنن الكبرى.
٢١. الزنا تحريمه – أسبابه و دوافعه – نتائجه آثاره – دندل جبر.
٢٢. دراسات في الإعلام الإسلامي – مصطفى بن أحمد كناكر.
٢٣. ثويبات قدور ٨١ اتجاهات الشباب البطال نحو تعاطي المخدرات.
٢٤. أبعاد الاغتراب النفسي و علاقتها بتعاطي المخدرات لدى المراهق سعيدي عتيقة.
٢٥. الأم للإمام محمد إدريس الشافعي، دار الوفاء.
٢٦. الصباح الجديد، جريدة يومية عراقية سياسية مستقلة تصدر من بغداد، ١٧ – ١١ – ٢٠١٨.
٢٧. وان نيوز ١٧ – ١١ – ٢٠١٦.
٢٨. الفقر – أسبابه آثاره علاجه من منظور إسلامي – محمد قاسم.
٢٩. (السفر آداب و أحكام) ى محمد صالح المنجد.
٣٠. غزو في الصميم عبدالرحمن حسن حبنكي الميداني – ص٣١٧.
٣١. الأنكحة المنهي عنها في الشريعة الإسلامية، تحسين بيرقدار. ٥٦٨، دار ابن حجر.
٣٢. الفقه و منهج الاستحقاق – يحيى سليمان.
٣٣. روضة المحبين.

٣٤. الفقه و منهج الاستحقاق: يحيى سليمان العقيلي.
٣٥. الجواب الكافي ابن القيم الجوزية.
٣٦. الغفة.
٣٧. الأمراض المنقولة جنسيا، د. عبدالرحيم عبدالله، دار الشروق، ط١، ٢٠٠٩.
٣٨. مجموعة الأبحاث القرآنية، للزلمي.
٣٩. الكامل للزلمي في الشريعة و القانون.
٤٠. گەنجان لە نێوان گرفتی سەردەم و چارەسەردا، د. إدريس كاريتانی.
٤١. چوارینەكانی خیام – وەرگێڕانی مامۆستا هەژار – پەخشانگای ئازادی.

# ناوەڕۆك